ناوی کتێب: من بەکاتی هەولێر نووسەر: نیگار نادر
پیتچن: نووسەر نەخشەسازی ناوەرۆك: سەید ئارام
بەرگ: لاوەند حاجی محەمەد چاپخانە:
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
ژمارەی سپاردن لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی
کتێبخانە گشتییەکان (   )ی ٢٠١٥

# من چ بکەم

سالی ٢٠١٥ لە هەولێرێی کاتبەند کرددووم، بەدەر
لەدەسەڵاتی خۆم کات پێنووسەکەی ڕاسپاردوم تا
بەتەوژمی مێژوو نیشانەی ڕاست بپێکێت ..

نیگار نادر

# من بەکاتی هەولێر

ئەوە منم بەکاتی هەولێرو بە زاراوەی تۆ، بە ناونیشانی ساڵی **٢٠١٥** لەسەر شەپۆلی سپی دەریای ناوەڕاست، بەپشتیوانی ئەستیرەی زوهرە، ئاسمان بەدواتدا دەپشکنم، لە رۆخی زەریای هێمن تا ئەوسەری دونیا لەسەر یەک هێڵ دەنگت نەخش

چندەکەم، لێرە بەدوا تەنها لەسەر فریکوێنسی چاوی تۆ دەبیستریێم و بەدیاردەکەوم و دەستەبەردەبم.

ئەوە منم بە بارستایی هەولێرو بە پاڵەپەستۆی زەوی چاولەدوتم، بەپێی پێوەری کێشکردن دڵت کێشم دەکا، بەوەنییە هاوخەسڵەتی ئەستێرەی سیوەیلم ڕۆژانە هەموو ئەتڵەس جیگۆڕکێم لەگەڵ دەکا، لەسەر لەرەلەرەی دڵم بە خێراترین تەوژم گەرمیت پەخش دەکا، دڵنیا نیم لەسەر کامە خولگەم و چۆن هاسەنگ

دەبم لەگەڵ زەوی و زەمان، دەڵێی لەناو دوو چەرخدا مەیووم نازانم دروست ئێستا ڕاستترین کات **٢٠١٥**یە یان **٢٠٥١**، ئەی کامیان گونجاوتر من وێنە دەکا؟!

ئەوە منم چەقی دڵی تۆم کاتبەند کردوە، دەزانی کاتبڕم و کاتم لە کاتژمێر زەوتکردوە، هەر دەشترسم کات دابەشترمکا، دەزانم هەمیشە کات لەبارو گونجاو نییە لەژیاندا، یان کات تەواو نییە یان کات بەسەرچووە یان کات لەدەست دەرچووە، یان کاتی

خۆی نەهاتووە، یان کات پەرچەکردارە، یان کات پێکدادەدات!

ئەوە منم بە شێوەزاری تۆ بەڕەنگی پەلکەزێڕینە بە دەنگی زەنگوڵە لەسەر پشتی هەولێر نەخش دەبم، بەبارتەقای ڕەوە ئەستیرەیەک دەکشێم تا لەچاوان ون دەبم، وەک سورە ماسی تیژ دەبزووم لەترسی ژاوەژاو و تۆڕو قولاپی ئەو ژیانەو لەبنی ئۆقیانۆسێکدا کۆشمە دەبم.

ئەوە منم بە فۆنەتیکی تۆ و خەتی سور ڕاست و چەپ بەسەر ژیاندا کێشراوم، زمانم بۆتە پێنووس و هەزارەها پیت لەناو سەرمدا وەکو چۆلەکە فڕەفڕدەکەن و وەکو گوڵی ئەتەمین وشەکان دەچنم و مێژووی هەولێریان لەسەر لێدەدەم.

*نیگار نادر*

۲۰۱۵/۵/۲۵

# خۆماڵیکردنی خۆم

چ عەترخانەیەکی قازاخم، بەبۆنی خۆم عەتری تایبەتم لەهەر شت و شمەکێکی ژیان دروستکردوە، پێموایە زۆرو زەوەند نیم لەخۆم، چونکە هەر عادەتیشمە هیچی کەمم ناوێ، بەڵام تا ئێستا نە کەمم هێناوە، نە لەخۆشم زێدە وەسەرگەڕاوم، دەمێکە دەمزانی دەبێت پڕ بەخۆم بم ئەوجار دەتوانم خۆم

خۆمـــاڵی بکـــەم و جێگـــە پەنجـــەی کـــەس و هیچـــم بەســـــەرەوە نـــەبێت، هەمیشـــە لەگـــەڵ ڕەهـــایی لەکێبڕکێـدام و لەگـەڵ ڕێـژەیی لەململانێـدا، چـونکە نامەوێت ژیان خەسارم بکا.

خوماڵیکردن جۆرێکـە لـە دڵۆپانـدن، هـەتا هـەموو گشتییەکان لەناو خۆتدا نەدڵۆپێنی، ئەسـتەمە بتـوانی تایبەتمەندیت هەبێت، مرۆڤ دەبێت چەندین جار درز بـدات تـا لەڕێگـەی ئـەو درزەوە هـەم فیکـر بچـێتە ناویەوە هەم فیکری لەبەربڕواو پاک بێتـەوە، مرۆڤـی

داوەستاو نەهیچی بۆ خۆماڵی دەکریٚ و نە خۆی بۆ خۆماڵی دەکریٚت...

لەسەدان خواست و نەریت و ریٚسا دەستم کیٚشاوەتەوە، لەسەدان حەزو هیواو خولیا دڵم کیٚشاوەتەوە تا خۆم خۆماڵی کردووە، خۆکۆکردنەوەو هزردۆزین و زمان هەڵکۆڵین دەسپیٚکی خۆ خۆماڵیکردنە، خودا دڵپشکی کردوین لە ژیاندا بۆئەوەی بزانین چ ڕیٚگایەک وە چۆن ئاراستەیەک و چ عەتریٚک هەڵبژیٚرین، ئەگەر مرۆڤ

چەندین جار بڕواو ئاوەزی خۆی لێکهەڵنەوەشێنێتەوە و دروستی نەکاتەوە هەرگیز ناتوانێ خۆی خۆماڵی بکات.

وەکو دەریایەک زۆر ڕووبارو جۆبارم هاتوونەتەوە سەر، تا چاو بڕ دەکا سنووری بیرکردنەوەو زمانیان فراوان بردووم، بەڵام هەمیشە پێویستم بە خۆ خەستکردنەوە هەیە،جا ئەو خەستکردنەوەش وەکو خەستبوونەوەی دەریایە و کارێکی سەختە، سەدان جار خۆخواردنەوە

دەستبەرداربوونی پێویستە، دەستەبەرداربوون لە زۆر شتی سەرەکی و خۆشەویست.

دڵگران نیم لەو کەسانەی ڕوون نامبینن و ناگەنە نزیکم، خۆ تەخسیری من نییە، چونکە هەمیشە سەرم وەک سەری چیا پڕ لەتەمە، چ بەسەر زمانم و چ بەناودڵ و چ بەمێشکمدا دێت لەدەستاڕی دەدەم، هەموو شتێک لەکاتی خۆیدا پەسەند دەکەم، نە چرکەیەک دوای دەخەم نەچرکەیەک پێشی دەخەم، ناهێڵم ژیان قەرەباڵغم بکا، دەنگم دەقی بشکێ و ڕەنگم کاڵ بێتەوە.

15

له کورده کاکڵەکانم، ئەو خۆڕاگری و بەرگەگری و خۆبەدەستەوەنەدان و نەبەزی و سەرکێشییەم لە میراتیە ڕەسەنەکەی کوردانەوە بۆ بەجێماوە و کۆی کرۆکی خەسڵەتەکانی منیان پێکهێناوە، لەبەرئەوەی ڕۆژهەڵاتییەکی پڕ لەڕۆژم، ڕۆژئاواش دەرەقەتی ڕۆژئاوابوون لەمندا نەهات و هەر بەگەرموگوڕی خۆمەوە پاراستمی، بەڵام دەبێت دانی پێدابنێم کە ڕۆژ هەم لەناومدا هەڵدێت و هەمیش ئاوا دەبێت بەو مانایەی بوومەتە تێکەڵەیەک لەنێوان هەردووک

کولتووری ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاواییدا.

پێموایە، پڕ ئاستەنگترین خەسڵەت بۆ مرۆڤ، خۆ خۆماڵیکردنە، مرۆڤ چەند ڕۆشنبیر، زانا، شارەزا، کارامەو کارزان و پسپۆر بێت ئەگەر خۆی خۆماڵی نەکردبێت، یا ئەو بەهرەیەی هەیەتی لەناوخۆیدا خۆماڵی نەکردبێت ئەوا هەرگیز ناتوانێ ببێتە کەسایەتییەکی تاقانە و شکۆی خۆی ڕابگەیەنێت و مرۆڤێکی سەرڕاست بێت...

شوێنپێی هیچ و کەسم هەڵنەگرتووە، لە شوێنپێی

خاکێک نەبێت، کە وابزانم وەها لەیەک ئاڵۆسکاوین بەهیچ لێک جودا ناکرێینەوە، خۆ خۆماڵیکردن پلەیەکە کەوا لە مرۆڤ دەکا عەتری تایبەت بخۆی بڕێژێ و مۆری تایبەت بەخۆی دروست بکا و بەناوی خۆی مۆر لەبەرهەمەکانی و لە ژیان بدا.

چۆن هاتمە ژیان دەمەوێ هەرواش لێی دەرچم بێ سازش بێ ڕتوش بێ، بەڵام هەرگیز نامەوێت بەبێ بەجێهێشتنی عەتری خۆم بڕۆم.

# هاوڕێیەک بەڕەنگی هەموو ژیان

هاوڕێیەتی ئەو کەسانە مەکە وەکو پەپوولە تەنها یەک وەرز دەمێننەوە، پشت بەو کەسانە مەبەستە کە وەکو شەمەندەفەر لەکاتبەندی دیاریکراوی خۆیاندا وێستگە بەجێدەهێڵن، ئەگەر دەیان موسافیر بەجێبمێنن یا بکەونە خوارەوەو گیان بسپێرن هەر ڕاناوەستن!

مەبە هاوڕێی ئەو کەسانەی وەکو ئەو فڕۆکانەی بە ئامادەبوونی یەک موسافیر دەفڕن. متمانە بەو

کەسانە مەکە وەکو ڕووبار لەنیوەی ڕێگادا دووڕا دەبن، هەرگیز گوێ مەدە ئەو کەسانەی تەنها دەیانەوێت گوێڕایەڵیان بیت، چاوەڕێیت لەو کەسانە نەبێت کە چاویان لەدوات نییە، مەچۆ سەر ئەو کەشتیانەی لەترسی تۆفان خۆیان غەرقدەکەن، سەر بۆ ئەو ئەستێرانە هەڵمەهێنە کە ڕەنگە بزرببن زوو بڕژێن، دەست مەخە دەستی ئەو دۆستانەی بە ئاشکرا ناوێرن دەستت بگرن ... هاوڕێیەک هەڵبژێرە وەکو ناوی دووەم دەمێنێتەوە لەگەڵ ناوی تۆ و هەمیشە پێی دەناسرێیتەوە..

# هی تۆیە بەڵام بۆ تۆ نییە!

مـرۆڤ دەکـرێ ببێتـە خـاوەنی زۆر کەلوپـەل و شمەک، بەڵام شەرت نییە ئەو شمەکە ببێتە موڵک یـان بەمەبەسـتی خاوەنداریـەتی هەتاهـەتایی بێـت، وردتـر سەرنج بدەین یەک لەو بابەتانە ژیانە، ژیان دەکرێ بە پرۆسەیەکی دووبەری بچوێنین بەو مانایەی کـە ژیـان هی ئێمەیە، بەڵام بەتایبەت و هەتاهەتایە بۆ هیچ یەک لـە ئێمـە نییـە!، هـەمووشمان ئـەو ڕاسـتییە دەزانـین،

بەڵام بە گەرمی دەژین و بەگەرمی خۆشمان دەوێت و لەناو ژیاندا بێ ئەژمار دەمانەوێ خۆشەویستی بکەین وە ئەستەمترین بڕیار بۆ ئێمە دەستەبەرداربوونی ژیانە بەهەموو خۆشەویستەکانییەوە... زۆر جاران مرۆڤ دەبێتە خاوەنی شتێک کە هەر مەبەستی نییە یا بۆتە خاوەندارو هەر ئاگایشی لێی نییە..
جەلالەدینی رۆمی دەفەرمووێ (عەقڵ هات، عاشق خۆت وەشێرە ئەتۆش، وای لەمن وای لەدەستی عەقڵ

و هۆش) بۆیه ئەگەر هەمووومان بە عەقڵ لەو ژیانە ڕامێنین زۆر ڕووی تری ژیان دەبینین و ژیرتر هەڵسوکەوتی تێدا دەکەین دڵنیا دەبین کە هیچی هی ئێمە نییە، بۆیە زۆرجار ئەو دەمانەی مرۆڤ هەڵدەکشێ بەرەو پلەیەکی بالآتر لە خەڵکی گشتی بە ناعاقڵ یان بە شێت دێتە تاریفکردن، ڕوونتر بڵێم ئەو کەسانەی دەگەنە پلەیەکی تایبەت لە فیکر و تێهزرین یا لە خوداپەرستی و عیرفان یا لە عەشقی ڕووحانی بە شێوەیەک لە شێوەکان سەر زەوی بە جێدەهێڵن،

ئەو پێناسە باوانە تێدەپەڕێنن کە بە گشتیکراون بۆ ژیان و دونیا و هۆشیان ئەوەندە هەڵدەکشی کە گوێ بە سنوورە دەستکردەکان نادەن و دەگەنە ئاستێک لە جیهانبینی، بەتەواوی لێیان ڕوون دەبێت کە خاوەنداریەتی ژیان ناکەن بۆ هەتاهەتایی و بۆیە بەقووڵی و تیژی، بەڕوونی فیکرو دڵیان لە ژیاندا هەڵسووکەوت دەکەن و بڕیار دەدەن و مرۆڤە گشتدیدەکان پێیان وایە ئەوانە لە دەرەوەی سنووری ئەقڵ داژۆن بە عەقڵی باو قەزاوەتی باو بەسەریان دەدەن و زۆر جار بە شێتیان ناوزەد دەکەن...

# دەترسێم یوسف ...

دەترسێم لە ئەتۆم نا کە چەندین تیۆرم لەسەر خوێندوە، لە تیرۆر نا کە بیرورِای دەیان زاناو فەیلەسوفم لەسەر ئەزبەرکردوە، لەچاوەکانی تۆ دەترسێم، یوسف، ئاخر من هێزی زوڵەیخام نەماوە، بەرگەی هۆگری ناگرم، باش دەزانم ئەو ترسە هێندەی ترسی بۆمبی ئەتۆمە کە پێشبینی دەکرێ جیهان

وێران بکا، دووقاتی ترسی تیرۆره که نازانی لەکوێ و چۆن پارچەپارچەت دەکا! نازانم چۆن دەرەقەتی چاوەکانت بێم کە نیشانە لەچاوەکانم دەگرێ و هەرچی تێیاندایە وردوخاشیان دەکا..

تۆ کێ بووی؟! ڕووناهی چاوەکانت بردم، مەندایی گیان لەناوەڕاستی دڵم ڕا تا بنی دونیا بیرت دەکەم. بەڵام هەر دەترسێم لە پێچەوانەبوونەوەی سوڕی زەمین، لە تاقانەیی تۆ لەناو حەوت ملیارد مرۆڤدا، لە ئەژماردەرچوونی ترپەکانی دڵم ئەو کاتەی دێی.

# هاوڕێیەک بە بۆنی عەتر..

هەندێک هاوڕێ هەن وەکو عەتر وان، بۆنی خۆیان بە خۆیانەوەیە، دەبنە پێداویستی لە ژیاندا، چۆن هەر عەترێک بۆنی خۆی هەیە هەر هاوڕێیەکیش بۆنی تایبەتی خۆی هەیە، چۆن عەتری ئەسڵ هەن بۆنیان بەهیچ نارِواو لەسەر گیان دەمینێتەوە، هاوڕێش هەن بۆنیان بەهیچ شتێک لەگیان نابێتەوە، گابرێل گارسیا مارکیز دەڵێ (هیچ شتێک لەوە بە

ئازارتر نییه، كه هاوڕێیەتی دروست نەبێت لەگەڵ ئەو كەسانەی دەبنە خۆشەویست و خێزانت)، هەرگیز مەرج نییە ئەو ڕەوە خەڵك و قەرەباڵغیەی دەوری مرۆڤ دەدەن بەناوی خێزان هاوڕێ لەگەڵیان هاوڕۆحی و هاوخوڵقی بسازێنی و ببنە عەتری ڕۆحت، مرۆڤ چۆن هەموو بۆنێكی لێ ناوەشێتەوە، هەروەهاش هەموو هاوڕێیەكی لێ ناوەشێتەوە..

ئاخر هاوڕێیەتی حاڵەتێكی دەروونی هێندە ناوازەو مەزنە زۆر كەم لەژیاندا ڕوودەدا تا یەكێك

بدۆزیەوە ببێتە هاوڕێی ژیانت، هاوڕێی سەرەڕۆ زۆر ڕێکەوت دەکەی لە ژیاندا، بەلاّم هەریەکەیان بەپێی بەرژەوەندی ژیان ڕای دەداو دووردەکەونەوە لێت، بەلاّم ئەوەی ئەسڵەکە ئەوە هاوڕێی عەترەکەیە کە هەموو ژیانت بۆندار دەکا.

# پاراستنی ئەخلاق لەسەردەمی مۆدێرنەدا

جێگای ئاماژە پێدانە کە لەو سەردەمەدا بەر لەهەموو شتێک ئەخلاق کەوتۆتە ژێر هەرەسێکی ڕەنگێنراو، چونکە ئێستا هەتا ئاستی موعجیزەبوون سەمایەداری و پارە کێبڕکێ لەگەڵ ئەخلاقی مرۆڤایەتیدا دەکا، مرۆڤی ئەو سەردەمە قوربانییەکی

مـــەزنترو بەرەنگارییـــەکی بـــەرینتری پێویســـتە بـــۆ پاراستنی ئەخلاق، گومـانی تێدانییـە کـە کـۆی بـزاوتی فیکرو فەلسەفە و ئاین دەرەقەتی ئەو گۆڕانکارییە پڕ ڕەگانەی ئەو سەردەمە نایەنن..

(دەسـتگرتن بـە ئـەخلاق)ەوە خەریکـە دەبێتـە پەروەردەو ڕۆشنبیرییەکی دەگمەن، سەردەمی پۆست ئایـدۆلۆژیا مرۆڤـی بـەرەو هەڵـدێرێکی ترسـناک بردوەو خسـتوویەتییە نێـوان دووڕیـانێکی داپۆشـراو بە تەکنۆلۆژیا و زانست، لەگەڵ بەناوکـەوتنی سـەدەی

بیست و یەکەمین تەکنۆلۆژیا هەڵتەکانێکی بەگوڕو بەهێزی بە سەر ئەخلاقدا هێنا، بۆیە پێموایە لەو سەردەمەدا دەستگرتن بە ئەخلاقەوە پێویستییەکی زۆر گرنگە و یەکە لە ئەرکە بنەڕەتیەکانی مرۆڤ بە جیاوازی تەمەن و پلەو پایەکانیەوە.

تەوژمەکانی بە جیهانی بوون و سەرمایەداری تەکنۆلۆژیا دەخوازن خەسڵەتەکانی ئەخلاق بەراوەژوو بکەنەوەو لەگەڵ ماف تێکهەڵکێشیان بکەن

و چۆنی بەرژەوەندیان دەخوازێ ئەوا ڕەتوشیان بکەن و دایانتاشتن..

درز تێکەوتنی ئەخلاق گەورەترین پشێوی لە دەروونی مرۆڤدا دروست دەکات، وا لە مرۆڤ دەکا قەناعەتی لەدەستت بدا، خۆپەرستی بگاتە ترۆپک و بکەوێتە ڕاوکردنی نرخ لەژیانیدا بەبێ ئەوەی هیچ ئاماژەیەک بۆ بەها بکا..

درزدانی ئەخلاق چەند سەرەیە، جۆرەها ڕوو و جۆرەها شێوازی هەیە، بەڵام سەرەکیترینیان لەبن

تویکڵی نرخ ڕا ئامانجی خۆی دەپێکی و بە تویکڵی نەخشێنراو ڕاوی هەستەکانی مرۆڤ دەکاو زۆر زیتانە خۆی لەگەڵ چێژی مرۆڤ دەسازێنێ و جووت دەکا.

# دڵژمێری ساڵی ٢٠١٤م

بابەت/ دڵژمێری ساڵی **٢٠١٤**م کاتژمێر/ **٦**ی سپێدە
بەروار/**٢٠١٤/١٢/٣٠** شوێن/ هەولێری پایتەخت

ئەورۆ ڕۆژێک پێش دواڕۆژی ئەو ساڵەیە، کە دەزانم لە **٥٢** هەفتە و **٣٦٥** ڕۆژ پێکهاتبوو، من ئێستا دانیشتووی هەولێرم، بەڵام نازانم دڵنیشتووی کوێی

دونیـــام؟ دەمـــەویٚ بـــەر لەتێپـــەڕبوونی ئـــەو ســـاڵە دڵژمێری خۆم بەدروستی تۆماربکەم...

لەسـەرەتادا بەفـەرمی ئەوە ڕادەگەیێنم، کـە بـەپێی پێوانـەی دڵـم کـە چـی ژمـاردووە، چـاوەکانم چـییان تۆمـارکردووە ئـەوە دەنووسـم، دەبێـت بەڕاشـکاوی ڕایبگەیەنم کە سوپاس بۆ ئەو ساڵە کە **٣٦٥** شەوی بـە من بەخشی کە لەناویاندا جوان خەوتم و مۆڵـەتی دام گزنگی بەربەیانیانی ببینم، بەگشتی ترپـەترپی دڵـم لـە ملیار کەڕەتی تێپەڕاندوەو بەهەزاران جاریش

ڕاچڵەکیوە، پێشێل بووە، کێوماڵ کراوە، چاوەکانم پتر لەهەزاران جار گریاندوون و تروکاندون و ملیۆنان جار تاساون و داتەکاون، سەدان جار پشتگوێ خراون. هەناسەکانم لەقەفەسەی سینگمدا زیاتر کەڵەکە دەبن و بەرزو نزمی هاتوچوونیان پەستانێکی نائاسایی دروست کردووە، نەفەسەکانم لەترسی ژیانی ئاڵودەبوو، سووڕی هەڵمژین و دەردانیان کەم بووە.

پەنجەکانم پتر لە سەدان جار بۆ پێنووس دانەویون و لەگەڵی سەرکێشیان کردووە، پێنووسەکەمیان پەنجە بەسەرکردووە، هەزاران جار پێنووسیان لەناوخۆ گرتووە، بەسەدان واژۆیان لەسەر تەناهی و دەرخستنی ڕاستییەکان کردووە.

ڕۆژەکانی ئەو ساڵە بەدەیان جار تەنیویانم، بڕیویانم، هاڕیویانم، سویویانم، دایانتەکاندووم و دەیان تاڵەموو تاڵەبرۆو برژانگیان هەڵوەراندووم، سەدان خڕۆکەی سپی و سووریان وشککردووم و

تەزانـدووم، سـەدان هۆرمۆنيـان تێکـداوم و چـەندين ڤيتامين و دەيان ڕژێنەو خانەيان شێواندووم.

دڵ لەو ساڵەدا چەندين جار درزی بردووە، سـەدان ڤايرۆسـی کوشـندە دزەيـان بۆنـاو کـردووە، لەترسـی بـەزين سـەدان جـار، دژە جوڵانـەوەی واژۆکـردووە، دەيان جار سەرانەی پەسەندکردووە.

دڵ مۆڵـەتی نيشـتەجێبوونی بـە دەيـان ئەسـتێرە و کەس داوە، پەنجەمۆری بە هـەزاران وشـەو پۆلـەهـەوری نـوێ کـردووە، بەنوێنەرايـەتيم چـەندين داوای

ئەڤینـــداری، عەشـــقی ســـواوی ڕەتکردۆتـــەوە، مـــافی ســـەری بـــەخۆی و دڵبـــەخۆیی بەخشـــیوەتە چـــەندین دۆست و هـاوڕێ، پشـتەوانەی یاسـایی داوەتـە سـەدان وشەو بەسەدان بزەی شیرینی خەڵات کردووە.

وا پێشبینی دەکەم هەر لـەو سـاڵەدا دڵـم ڕووبـەری سەدان کیلۆمەتر دووجا فراوان بووە، بەپۆل باڵندەی جـوان، وشـەی سـەرکێش، ئۆقیانووسـی لەناوخۆیـدا کـەوی کـردووە، نـە پـۆزش و نەسازشـی لەسـەر دڵ پەســەند کــردووە، گــەورەترین بەنــداوی عیشــقی

لەناوخۆیدا چێکردووە، دەیان ئاڵای جوانی هەڵداوە، لەگەڵ سەختترین لوتکە دانوساندنی کردووە.

دەزانم ساڵ نوێ بۆتەوەو منیش کۆن، ئەو ژمارەیەکی زیادکردووەو منیش ژمارەیەکم کەم کردووە، وەکو شەمەندەفەر تیژ بەتەنیشتمدا تێپەڕیوە، هێز و گەشی و ترپەی دڵی من نا، هی هەزارەها مرۆڤی لەگەڵ خۆی بردووە، ئەو ڕۆیشتووە دڵنیام ناگەڕێتەوە چەندین تاسەو بیرەوەری و یادگاریمی لەگەڵ خۆی لوول کردووە،

که هەمیشه دوعاخوازبووم لەناویاندا چەقببەستم و بمەییم یا هەرنەبێ جارێکی دی بتوانم بەناویاندا تێپەڕمەوە، ئەو چەند شەقامی جوانمی لەگەڵ خۆی ڕادان و بزرکردن، چەندین هێماو خەتی تەڵخی بەسەر داهێناوم و لێی سڕیومەتەوە.

هەمووومان دەبێت دانی پێدابنێین کە ساڵ چی لێ زیاد کردووین و چی لێ کەمکردوینەتەوە، بۆ من لەسەرەتادا هەموو دەرئەنجامەکان وایدەردەخەن کە لە ساڵی **٢٠١٤**دا ڕێژەی قوربانیدانم بۆ کوردستان

هەر لە بەرزترین ئاستی خۆیدایە و هیچی کەم نەکردووە، تەوژمەکانی دڵم لەئاستی دەریا دەهێندە بەرزتر بوونەتەوە. سوپاس بۆ ئەو ساڵە کە لەناو خۆیدا بە ڕەنگ و سروشتی خۆم دەورەیدام و پاراستومی نەیهێشت لەسەر تەختی نەخۆشخانەیەک چاوەڕێ بمێنمەوە یا لە سەر تەختی شێتخانەیەک ببەسترێمەوە، بچمە سەرەی ئارایشگایەکان، بەر ئاوێنەی پزیشکی جوانکارییەکان، هەلبچۆقێم لەبەر جامخانەی زێڕینگەرو دوکانی مارکەکان تا خۆم ببینمەوە.

دڵ، شەپۆلەکانی خۆشەویستی لەناویدا لەڕادەی ئاسایی تێپەڕی کردووە، چاوەکانم ڕێژەی خوماری و تیژی هەنگاوتنیان دووهێندە بڵند بووە، زمان بە سەدان وشەی نوێی پالاوتوەو داڕشتوەو پڕشنگدار کردووە.

هزر بەهەر چوارلایاندا بیرۆکە و پڕۆژەی ناوازەی لەبێژینگ داون و تۆمارکردون، ڕێژەی سروشتم هەر وەکو خۆی نەگۆڕەو ژنێکی باڵندە سروشتم و لەگەڵ مرۆڤەکان بەترسەوەو کەم نزیکیم کردووە، کێوی

بـوونم لــه ئاســتی خۆیـدا چــەقی بەســتووه، تــەنهاییم دووبەرابەر هەڵکشاوەو بەرین بووه، ڕۆحـم دووقـات شیلەی دەرداوەو بەبڕشتر بووه، قاقایـەکانم هــەر بـە گەرمی مامناوەندی خۆیان ڕوخساریان نەخشاندوم.

وادیاره ساڵ نیشـانەی لێگرتبـووم و بـە دڵـی خـۆی پێکاومی، چۆنی ویستوه لەوێ ڕایوەستاندوم، چـۆنی خواستوه وا هێمای چەوتی بەسـەردا هێنـاوم، سـەدان هەسـت و خەنـدەی پاکتـاوکردووم، دەیـان ئابلۆقـەی بەســەردا ســەپاندوم، دابەشـیکردوم بــە ســەر چــەند

ئەستێرەیەکدا، چەند ئەستێرەی تێدا خامۆش کردوم، هەموو پیلانێکی بۆ وەرگەڕان لەخەتی خۆم، لە ڕێگای خــۆم بەمەبەســتی بــوونم بــەژنێکی گشــتی لەســەر تاقیکردومەتەوە.

لــەو ســاڵەدا بەڕاســت و چــەپدا خــەم هێرشــیان بــۆ هێناوم، پلەی گەرمیم بەشێوەیەکی بەرچاو دابەزیوە، بەگشــتی قاقایــەکانم کــەمیانکردووە، هیوایــەکانم مۆرانــەیان تێکــەوتوە، تاقــە ئومێــد کــە ماومــە ئاســتی هاوســەنگیم، هــاوڕەنگیم، هــاودەنگیم لەگــەڵ مــانگ،

گۆڕانکاری بەخۆیەوە نەدیوەو جێگیر بووە، لەگەڵ گوڵەکان سەرم پێکەوە ناوەو سەبرهاتنم بە باڵندەو ئەسپەکان دووقات بڵندبووە.

ئەو ساڵە سەدان جار خستومیەتە دەنگدان، چەندین جار ڕاپرسی لەسەر کردووم، چەندین بڕگەی هەموارکردوومەتەوە، چەندین یاسای هەڵوەشاندومەتەوە، بەسەدان شێوە ڕوپێوی کردوم، بەدڵی خۆی بژاری کردووم.

لەو ساڵەدا تا لووتکە بەرەنگاریم کردووە لە دژی خۆبەدەستەوەدان، نە بیرم بە دەستەوەداوە نەدڵم، نە چاوەکانم، نە باوەڕەکانم، نە سەرکێشییەکانم، نە وەفادارییەکانم، نە ڕایە بێ ڕکابەرەکانم.

لەکۆتایی ساڵی **٢٠١٤** ئەو دڵژمێرییەی تۆمارکردووە، بەڵام نە سەرژمێری گشتی نەپێشبینیەک نەئاگادارکردنەوەیەک نە هێڵی سور، نە ئامارێک نە نەخشەیەک نە ڕاپرسییەکم بۆ پێشنیارکراوە! دڵ هەروەکو خۆم تاق و تەنیا چەقی بەستووە..

# خووە خۆشەکانی خۆم

هەموو ئێواران دووسێ جار هەر سەیری ئاسمان دەکەم، تا مانگ نەبینم ئۆقرە ناگرم، نەرم نەرم گوێ بۆ دەنگی گرامەفۆنەکەم ڕادەگرم، گرنگ نییە چەند لێم دووری، هەر لەگەڵ تۆ گەرم پێدەکەنم و چەند دوعات بە بادا بۆ ڕەوانە دەکەم، دەبێت دەست لە پەلک و گەڵای هەر درەخت و گوڵێک بدەم کە لەسەر

ڕێگامن و دڵنەواییم دەکەن، هەمیشە مۆم لە تەنیشت خۆم پێدەکەم، دووسێ جار وەک فڕفڕۆکە دەورو خولی پێنووسەکەم دەدەم، هەر باڵندەیەک ببینم سڵاوی لێ دەکەم، تا ئەستێرەیەک ببینم چەندجار خۆم ئاودیودەکەم، چەند تەشقەڵە و شەڕی لابەلاش بە هاوڕێ شیرینەکەم دەفرۆشم، تا کتێبێک لەباوەش نەگرم سەبر ناگرم و سەد گێچەڵ بەخۆم دەکەم، دەجار مان دەگرم لەخۆم، سێ چوارجار عەتر بە خۆمدا دەپرژێنم، لەگەڵ یەک دوو ڕستەی جوان

سەرەتاتکێ دەکەم، هەر جارێکیش بێت، بەدڵ هاژەهاژ بۆ سەرچاوەکەم دەکەم و هەموو وشەکانمی لەگەڵ بەش دەکەم. دونیا لەسەر نەخشەی چاوی تۆ چێدەکەم.

# ژوورێک بەتامی قەیسی نا بەتامی دونیا

گرنگ نییە چەند کیلۆمەترت لەو دونیایە بەناوەوە بێت گرنگ ئەوەندە مەترەیە دڵت لەناویدا خۆش بێت، ژوورەکەی لەندەنم دووونیو بە سێ مەتر بوو، بەڵام هەمیشە دونیا بەگەورەیی خۆی لەگەڵم لەوێ دابوو، ئەی ئەگەر لەوێ فێری قەناعەت بووم فێری ئارام گرتن بووم فێری بەرگەگرتنی ئازار، فێری

جۆرەهـــا بـــەرەنگاری فێـــری جۆرەهـــا نەبـــەزین و فیـداکاری، هـەر لەوێـدا فێـری زمـانی ئینگلیـزی بـووم فێری ناسینی چەندین نووسەری مەزن و جوان بووم، ژوورەکەم پڕ بوو لەوانەی خۆشمدەوێن هەر لـەکتێب و وێنەو تابلۆ و گـوڵ و بخـور و مـۆمی جـوان جـوان، لەو ئاوێنانەی ڕەنگی ڕاستەقینەی خـۆم وەک ژنێکـی ڕەسەنی کوردیان نیشاندەدام، لەگەڵ ئامێرێکی چاپی دەسـتی و دەسـتە پێنووسـی ڕەنگـاوڕەنگ بۆئـەوەی هەمیشە مەشقم بدەن بۆ نووسین، کۆمەڵێک سیدی

کلاسیکی وەک سەید عەلی ئەسغەر، خالقی، ئەحمەد شەماڵ، عەلی مەردان، سەلاح داودە، ئیدیڤ پەیاف، فەیرۆز، فرانک سانتا، نینا سایمۆن، هەر هەتا ڕۆحم وشک هەڵنەگەڕێ لە تەنهاییان.

هەر لەو ژوورەمدا تێگەیشتم کە تەنهایی چەند پڕوکێنەرو چەندیش بنیاتنەرە، چەند ترسێنەرو چەند ئارامبەخشە، جۆرەها تەنهاییم تاقی کردەوە و تەنهایی تایبەت بەخۆمم مۆرکرد، هەر لەوێڕا فێربووم نابێ ڕاوەستی تا باڵت دێت، نابێت هەموو

شتێک پەسەند بکەیت ئەگەر نا، ناوی خۆشت لێ زیاددەبێت. هەر لەوێدا ئەستێرەکان مەشقیان دام لەسەر بەردەوامبوون لە تروسکان لەسەر بزربوون و سەرهەڵدانەوەی بەردەوام، لەسەر هاوەڵبوون لەگەڵ هاوخاسییەتەکان.

من هەمیشە چێژی خۆم دەپارێزم، نە تەماشای هەموو شتێک دەکەم نە گوێ لە هەموو کەس دەگرم، بۆ من ئەو ژوورە تامی دونیا دەدا، چونکە هەرچی دڵ خواستبای هەمبوو، هەر لە پەنجەرەیەکی جوان

کە پیرە درەختێکی لەبن بوو بەسەدان باڵندە هەمیشە لەسەر وێ ڕا ئاگایان لەمن بوو، ئارامییەک کە کەم جار لە دونیا بەدی دێت، ئێواران بە کەشێکی دڵارام سڵاوم لە گڵۆپە زەردەکانی سەری کۆڵانی دەکرد و شەوانی بەفرانبار تا نیوەشەوان سەرم بە شوشەی پەنجەرەکەم دەکردو دونیام لەگەڵ کڵۆ بەفرەکان ئاڵوگۆڕ دەکرد، لەبەر مۆمە بۆن لاڤەندەرەکان زۆر جاران لاپەڕەکانی مەولەوی و ئەحمەدی خانی و دریداو کۆندێرام هەڵگێڕو داگێڕ دەکرد، من قەرزاری

ئەو ژوورەم، بۆیە دڵنیام هیچ گرنگ نییە چەند مەتر لەو دونیایە بەکاردێنی، گرنگە چی تێدا بەرهەم دەهێنی، چونکە گۆڕیش هەر ئەوەندە ڕووبەر بە مرۆڤ نادات.

هەر لەو ژوورەمدا بە ڕێکەوت گڵۆپ پێ دەکرا، چونکە هەر بەگشتی حەز لە ڕووناکییە دەستکردەکان ناکەم، هەمیشە خوێندنەوەی بەر لامپا و مۆم زۆرتر ئارامیم پێدەبەخشن، ڕێگەیەکن بۆ بینینی شتەکان بەڕەنگی ڕاستەقینەی خۆیان،

هەروەها جۆرەها ڕۆنی ئارامبەخش کە مۆمم لە ژێریاندا داگیرساند، هەم بۆن و هەم ڕووناکی تێکەڵەیەکی هاوسەنگی ڕۆحییان نەخش دەکردم.

ژوورەکەی هەولێریم سێ بەچوار مەترە، ئەوە بەڕەسمی حاڵی حازر پایتەختی منە، ڕاستە هێشتا کوردستان سەربەخۆیی ڕانەگەیاندوە، بەڵام لە ژوورەکەی مندا لەو ڕۆژەوەی گەڕاومەتەوە بە فەرمی سەربەخۆیی ڕاگەیاندراوە، ئەو ژوورە سەر بەهیچ کەس و لایەنێک نییە لەخۆم زیاتر، لەو

ژوورەدا خزمەتکردنی کوردستانم دەسپێکردووە لەو ژوورەدا دەیان کتێبم خوێندۆتەوەو چەندین بەرهەمی جوانم نووسیوە، ئەو ژوورەشم زۆر تایبەتە، چونکە کارخانەی منەو کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لە دروستکردنی من، لەو ژوورەدا بە کاتژمێر بەدوای وشەیەک دا دەگەڕێم، سەدان جار ڕستەیەک هەڵدەوەشێنمەوەو دایدەڕێژمەوە، بە کاتژمێر زەینم دەفڕێتە سەر لوتکەیەک، ڕەنگی تاوسێک داگیرم دەکا.

لەو ژوورەدا سەرەداوی دەیان خزمەت بەکوردستان لەناو سەرمدا پرۆشە دەکا، هەر تاوناتاوێک دڵم سەد پەنجەمۆر لە پاراستنی خاکی کوردستان دەدا، لەو کارخانەدا هەرگیز وشە دانانەوێت، شکۆی ناشکێنرێت، نرخی ناشێوێت، زۆر بەئەمانەتەوە لە جێگەی خۆی دادەنرێت.

من دەزانم ڕۆژی چەند جار لە چەند لایانەوە خاکی کوردستان پێشێلدەکرێ، چەندەها جۆرە سیخوڕی تێدەزێ، بەڵام سنووری ئەو ژوورەم کە

کارخانەی منە، سنووری گیانی منە، نە هیچ بێگانەیەک پێی تێدەنێ نە هیچ بەکرێگیراوێکیش تێیدا نیشتەجێ دەبێت نەهیچ مرۆڤێکی گشتیش بۆی هەیە لە قەرەی کەوێت و سنووری ببەزێنێت.

لەو ژوورەمدا دەنگێک نایەت جگە لەدەنگی نەرمی خۆم و دەنگی گرامەفۆنەکەم کە لە تەنیشتی گرامەفۆنەکەم جۆرەها قەوانی کلاسیک، جاز، هەڵچنراون.

من زۆر لە ژاوەژاوەکانی دونیا دەترسێم لەهەموو ئەو دەنگانە دەترسێم کە وەکو شەقامی گشتیم لێدەکەن، لە تیڤی و ڕادیۆو هەموو ئەو ترومبێلانە دەترسێم وەکو شێتخانەی گشتی قەرەباڵغم دەکەن، ئاخر من هەرگیز ڕێگە نادەم هەموو کەس بەویستی خۆی بەناو شەقامەکانم بکەوێت لە باخەکانمدا درەختەکانم ڕاوەشێنێت، هەرچی بیەوێت لەناو مندا تاقی بکاتەوەو تا سەرئەنجام بمکاتە سەرانگوێلکی گشتی و بەجێمبهێڵێت، هیچ دەنگێک بەبێ خواستی

خـۆم نـاتوانىٚ چـيٚژم بشـيٚويٚنىٚ و ڕۆژانـه سـه‌د جـار وه‌كـو ئـه‌مبولاٚنس و ئۆتـۆمبيٚلى ئاگركوژيٚنـه‌وه به‌ناومدا تيٚپه‌ڕيٚت يان وه‌كو مزگه‌وت بلٚندگۆم له‌سه‌ر دابنيٚن..

ژووره‌كه‌م ڕووى له قيبله‌يه بۆيه به يه‌كه‌م گزنگى سبه‌ينان چاوهه‌لٚده‌هيٚنم، يه‌كڕاست ئوميٚدى سه‌لامه‌تى بـۆ هـه‌موو زينـده‌وه‌ره‌كانى سـه‌رزه‌مين ده‌خـوازم بـه‌گويٚكردن لـه مـۆزيكيٚكى نـه‌رم هيٚـور هيٚـور پـىٚ ده‌خه‌مه ناو به‌يان و جوولٚه ده‌ست پيٚده‌كه‌م، يا له‌به‌ر

لێوەکانمەوە گۆرانییەک لە دڵڕا بۆ ژیان دەچڕم.

بۆ من هەرگیز ڕووبەری شوێن گرنگ نییە، هێندەی ڕووبەری دڵ، هەموو شتێکیش لە ڕووبەری دڵی خۆمڕا تەماشا دەکەم، ئێستا پاراستنی هێمنی ئەو ژوورە لە ئەستۆی منە، من بەهیچ شێوەیەک ڕێگە نادەم شێوە ژیانی بەدەڵی شێوێنراوی کوردستان بخزێتە ناو ژوورەکەم، چونکە من نە مەکینەی حیزبایەتیم، نە دەستاری نووسەرانم، نە داوەڵی میدیام، نە بوکەبەبارانەی کۆمەڵگام، نە تووتی دادگا،

ئەگەر خوانەخواستە هەر یەکێک لەوانە بەناومدا دزە بکا ئەوا گەورەترین درز لە پاکی و دونیا گچکەڵەکەم دەخا، بۆ ڕیزی گشتی بوون پەلکێشم دەکا.

هەر لەو ژوورەشمدا هەموو ئەو شمەکانەی خۆشمدەوێن و کەیفم سازدەکەن چواردەوریان داوم، هەر لە کتێب و دیوانەکانی وەفایی، مەولەوی، ئەحمەدی خانی، نالی، کوردی، مەسعود محەمەد، شوکر مستەفا، مەحموود زامدار، سابیر هاکا، مەولانا، جوبران، نزار قەبانی، چەندین کتێبی

ناوازەی تر لە کتێبخانەیەکدا بەرامبەر جێگای نووستنەکەم هەمیشە لێم دەڕوانن، دووفەرشی سونەتی پڕ لە باڵندە کە هەم بۆ یۆگاکردن هەم بۆ دوعا خوێندن هەم بۆ شیعرخوێندنەوە چوارمەشقی لەسەریان دادەنیشم کە بە ڕەنگێکی سورو زەردی تۆخ و لەنێوان سیسەم و کتێبخانەکەمدا ڕاخراون.

ژوورەکەم هیچ کاتژمێرێکی تێدا نییە، چونکە من دژە پێوانم، کە دێمە ئێرەش نامەوێ ببمە دیلی ئەو دوو میلەی بەسەر چەند ژمارەیەکدا دەسوڕێنەوە بە

دڵی خۆی لە تەمەنی من کەمکاتەوە، نامەوێ ئەو چرکە چرکە ببیستم و بەبیرم بێنێتەوە کە من چرکە لەدوای چرکە بەسەردەچم، نامەوێ تا چاو هەڵێنم ئەو نیشانم بدا کە زۆر درەنگە، زەحمەتە بەهیچ شتێک ڕابگەم و ژیان خەریکە بەجێمدەهێڵێ.

هەر لەو ژوورەمدا کورسییەکی قەدیفەی گوڵگوڵی سور هەیە، ئەو کورسییە تاقە کورسی ڕاستەقینەی دونیای خۆمەو سەربەخۆمە، نە لە هیچ کەسم وەرگرتووەو نە لەکەسەوە بۆم بەجێماوە،

نەدەسەڵاتی حیزبی، نە حکومی، نە ڕۆشنبیری، نە کۆمەڵایەتی بۆی ڕەخساندووم، ئەوە تاکە جێگەیە کە پڕ بە شکۆی خۆمە، چونکە کاتێک لەسەر ئەو کورسییە دادەنیشم بە پۆل هزری جوان خۆیان بەناو سەرمدا دەکەن، بە ڕەوە وشە وەک پەپوولە چواردەورەم تەوقدەدەن، لە دڵم زیاتر کەسی دیکە بۆی نییە فەرمانی هەستانم پێبکا. هیچ ئەرکێکم بەسەردا بسەپێنێ، کەس ڕێگەپێدراو نییە ناچاری ملکەچبوون و دانەوان و سازشکردن و بێدەنگ بوونم

بکـــا، کـــەس مـــافی ئـــەوەی نییـــە بڕیـــاری پێنـــووس بەســـەرکردن و پێنـــووس شـــۆڕکردن و پێنـــووس کـــپ کردن و پێنووس داگرتنم بـۆ دەرکـا، بـە مۆڵـەتی هـیچ کەس لەسەری دانانیشم و هەڵناستم، تاکە جێگەیە کـە لەسەری وەکو دەریا دەستەمۆدەبم و ئـۆقرە دەگـرم، دەبێتە هۆی ئەوەی کە دڵم پڕ بە خۆی خڕۆکەی سـور دەرکا و پشوی ڕەسمی بۆ هەموو جەستەم دەربکا.

لێرەدا جۆرەها دەریاو زەریـا مـاڵی کـراوە، چـیاو لوتکـــەی ســـەخت مـــافی نیشـــتەجێبوونیان

پێدراوە، لەو ژوورەدا پلەی گەرمی دڵم هێندە بڵندە مانگ و ساڵ تێیدا بەهەڵم دەبن هیچ هەست بە تێپەڕبوونی تەمەنم ناکەم، چونکە هێندە ئەو سەرقاڵییەم خۆشدەوێت کە بۆ خزمەتکردنی ئەو نیشتمانە هەمەو هێندە سەرگەرمی ئەو قەرەباڵغییەم کە ڕۆژێ بەدەیان وشە بەناوم دەکەون و هاتوچۆم پێدادەکەن. لەو کارخانەمدا دڵ ڕووبەری دە بەرابەر فراوانبووە، ڕۆژانە بەپێی فراوانبوونی سنوورەکانی ئەرکی نوێی پێ دەسپێرم.

# دونیا بە دەنگی شەکری تۆوە

هەر یەکێک لەو ژیانەدا دەنگێکی تایبەتی پێویستە هەتا ژیانی پێ پڕ جۆشوخرۆش کا، گەرم گەرم ئینێرژی و وزە بە دڵی بدا، بەسەرپێوە ڕایوەستێنێت و بەبێ وەستان جوولە بەدەستەکانی بکات، لە هەڵدێران ڕزگاری بکا، لە ئاسمان ڕا پشتیوانی بکا.

بۆ من ئەو دەنگە شەکرە بەسەعات بەرامبەری

تابلۆیەک ڕادەگرێ، گوێم پێ لە حەیرانێک، سیمفۆنیایەک، گۆرانییەکی شیرین ڕادەگرێ، لەناو چەندین کتێبی جواندا لەنگەرم پێدەگرێ، لەگەڵ دەیان دوعای پاک باڵم پێدەگرێ، سەدان وشەم پێ بروسکە دەگرێ، پێنووس لەناو پەنجەکانمدا ڕادەگرێ، هەر لە شیرینی ئەو دەنگە، پێکەنینە گەرمەکەم وەکو کەفی دەریا سپی سپی جەستەم دادەگرێ، چاوەکانم لە ئاپۆرا دادەبڕێ، هەتا نەمکاتە شەربەت ئامانی لێ نابڕێ.

# بەتەنها شیعر ناهێڵێ بیەزم

ماریۆ ڤارگاس یۆسا دەڵێت (بە هۆی شیعرەوە دەتوانین چەند جۆرێک لەژیان بژین) منیش دەڵێم (بەهۆی شیعرەوە دەتوانین دەستبەسەرو بیربەسەرو دڵبەسەر نەبین) هەمیشە ئەو هەستە ناهێڵێت ببەزم کە بەشیعرەوە چەندە مرۆڤم، ژنم، جوانم، ڕەسەنم، پڕ شکۆم، بەبەردەوامی لەخۆم دەپرسم ئەگەر خاوەن ئەو بەهرە ناوازە نەبام، دەبوو جێگام لە کوێ

بوایـه؟! چـۆن ژنێکـی ڕواڵـەتی بـام کـە تاکـە خـەونم ئەوەبوایـە کـە پیاوێـک بـە جـوانم بـانگ بکـا و وەک دەزگای خێرخوازی بەخانمی خۆیم ناوزەدبکا؟! یا تـا دەمـردم سەوداسـەری خـۆ ڕازاندنـەوە بـە کـەوش و پۆشاکی مارکـەدار بـام تـا هەسـتم کردبـا نـرخم پێیـان زیاد دەکا! یـا وەکـو مەکینەیـەکی بەرهـەمهێنان تاکـە هیـواو کـارم خێـزان و منـداڵ دروسـتکردن بـا ! یـا سـەردانەوانم بـۆ سـەدان مرۆڤـی گەمـژە پـێ سەرەکیترین ئەرک با، یا بەزینم پێ تاکە چارەنووسی

خۆم بوایە، یا خۆم وەک ژمارە دوو، لە ڕیزی دووەم قبوڵکردبا، یان لە مردنیشدا پاشکۆ بوونم پەسەندکردبا. یان هەمیشە دڵم جڵەوی ژیانمی بەدەستەوە نەگرتبا، یان دڵم بە نوێنەرایەتی کردنم لەو ژیانەدا ڕازی نەبوایە.
بەڵام هەر شیعر نەیهێشت هەست بەکەمی بکەم، نەیهێشت ئازاری کوشندە بمژاکێنێ، شیعر نەیهێشت قاقایەکانم سارد ببنەوە، ڕێگەی نەدا غەریبی و تاراوگە ڕەنگم بگۆڕێ، بۆنم بگۆڕێ، چاوڕوونی کردم

و نەیهێشت ون بم، ڕێگەی نەدا لێڵ بم، شـیعر لـە مـاڵی بـوون قوتـاری کـردم، تاکـە تـاج بـوو لەسـەرم نـا، بەهێزترین دژە بەزین و دژەگشتی بوون و دژە سوان و دژە پیری بوو بۆ من، هەر شیعر بوو دڵـی پاراسـتم، لـە پـیس بـوون و لـە سـیس بـوون و لەداوەسـتان، لـە ڕاوەستان، لە گلان، لەدانەوان.

شـیعر جۆرەهـا بـەرگری فێرکـردم، ئـاڵای لەسـەر هەڵدام، شیعر نەیهێشت هەرگیز بە چۆکدابێم ، ڕێگەی نـەدام لەنگـەر بگـرم، نەیهێشـت ژنێکـی خـاڵی بم لـەو

ژیانەدا، پاراستمی لە دڵ بەبەدەڵی، لەدەستبەدەڵی، لەبیربەدەڵی، پڕ بەدڵی خۆم دونیای لەناومدا کەوی کرد، هاوڕێیەتیمی لەگەڵ ئەستێرەکانی ئاسمانی دروستکرد.

ئەی خودایە ئەگەر شیعر نەبا، دەبوو لەو ژیانەدا چەند ڕەتەڵم بردبا، چەند گەمژەم پێ سەرکردە با، چۆن نرخ و بەهام لێ تێکەڵبووبا، چەند جار دڵم سەرچیغ ڕۆیشتبا، چۆن وەک ڕووبار بەگێژەنێک ژیانم شڵەقابا، وەکو نێچیر دڵم لەتەڵەی سەدان مرۆڤی بودەڵە کەوتبا.

ئـەی ئەگـەر ژیـانم تـەواو لـەو بەهرەیـە خـاڵی بـا، دەبـوو چـەند ڕێگـام لـەو ژیانـەدا هەڵـە کردبـا، چـۆن چـاوەڕێی ئافـەرینی ئـەو کۆمەڵگەیـە، مـنی زینـدە بـە دزیــوی کردبــا، ژیــانم بەچــەند جــۆرە ملکەچــی تەوقدرابا، چاوەکانم چۆن خـاڵی لـە شکۆ بـان، چـۆن ژیان لە ناو یەک پیاو و یەک نیشتیماندا منی ئابلۆقـە دابـا، ئەگـەر شـیعر نـەبا چـۆن وشـەکانم وەکـو مـۆم داگیرسـاندبان، چـۆن لـەناو هــەر وشـەیەکی جوانـدا خۆم بەدڵی سەدان عاشـقدا کردبـا، دەبـوو ئـەو ژیانـە

تاڵە چۆن چۆنی دڵمی پێشێل کردبا، وەک ژنێکی بن
نایلۆن دڵم ژیان و شمەکە بەنرخەکانیان پێوانەکردبا،
نە ڕەنگی با نە بۆنی باران ڕێکەوتی ناو سینگمیان
نەکردبا ..

ئەی خودایە بەشیعرەوە چەند نازدارم، چەند
ڕەنگینم، چەند سەنگینم، بە شیعرەوە هەست دەکەم
هەمیشە ژیان چاوەڕێی ئامێزمە، مانگ لەناو دڵمدا
هەست بەتەناهی دەکا، ئەستێرە نەماوە لەو
ئاسمانەی کە داوای هاوژینیم لێنەکا، ڕووبار بە

سەرچاوەی خۆیـانم ئـەژمار دەکـەن و چـیایەکانیش سەرەیان گرتوە لە چاوەڕوانیمدا..

دەبوو بەبێ شیعر ناوم لەکوێ نوسرابا؟! لـە پشـتی ناســـنامەو پاســـپۆرتی پیاوێـــک، لـــە ڕەچـــەتەی ئارایشـتگایەکان، لەسـەر تـابلۆی ڕێکلامـی کـەوش و ترۆمبێلەکان، لە ناو لیستی پزیشکی جوانکارییـەکان، لەسەر ڕەچەتەی ڕێجیمی لاوازی و سەعاتە مارکەکان، لەلیسـتی چـاوەڕوانی بـەکرێگرتنی ژنـە خزمـەتکارە ئاســـــیاییەکان، لەلیســــــتی فەرمانبــــــەرە

فەرمانپەرستەکانی دەوڵەت، لە لیستی شاراوەی قاچاخچییەکانی سیاسەت بۆ پۆستەکان، لەسەر ڕەچەتەی زێڕینگەرو قوماشە گرانەکان، ناوی خۆم ڕێکەوتکردبا.

شیعر جۆرەها مەشقی پێکردم، مەشق لەنێوان مەرگ و ژیان، مەشقی ڕەوشەن بوون، مەشقی دژە ملکەچبوون، مەشقی بە خۆماڵیکردنی ئازادی و ئازار، مەشقی سەربەخۆبوون، مەشقی پێداگرتن، مەشقی نەسرەوتن، مەشقی بەرەو ترۆپک سەرکەوتن، مەشقی

دڵ خواستنم بە هەموو ناوک و توێکڵەکان.

شیعر ناهێڵێت ببەزم، دانەوێنم، سازشبکەم، دڵ هەرزانفرۆشکەم، زمانم دەستەمۆ بکەم، دانوساندن لەسەر ناوازەیم بکەم، درز ببەم، کەڕو دەرکەم، لەخۆبایی بم، پێکەنینە خۆڕسک و دڵە ئاوەڵایەکەم بەهیچ نرخێک ئاوەژووکەم.

هەر بەهۆی شیعرەوە لە ڕێگای گشتی، مافی گشتی، خەونی گشتی، یاسای گشتی ژناندا هەڵبڕام و تەنها مامەوە، شیعر چ تەنهاییەکی جوانی وەکو

دیــاری پێبەخشــیم، شــیعر پاراســتمی لــەوەی نــاوم بەتەنها لەسەرپشتی کێڵی قەبرەکەم نەچەسپێ و ناوم گواسترایەوە سەر پشتی چەندین کتێبی جوان، شـیعر ویســتی نــاوم قــەتیس نــەمێنێ لــەناو مــیراتی تاکــە خانەوادەیەک، دووباڵی نەخشینی پێبەخشیم بۆ فڕین لەناو ئاسمانی نووسین.

خودایە سوپاسگوزارم کـە بـەو بەهرەیـە پـیرۆزت کردووم، کە هەمیشە وەک پەپوولەیەک هەست دەکەم هەم تەمەنم کورتە هەم ژیانیش کورتە.

خودایە سوپاسگوزارم کە نەبەهیچتەوە گرێدام، نە

هیچت پێوەلکاندم، نە لێت کەمکردمەوە، نە لەخۆم
زیاترت بەسەردا سەپاندم، ڕوخسەتت دام لەو ژیانەدا
دروست وەکو خۆم بمێنمەوە، هێندەی توانای خۆم
پێ هەڵێنم، پڕ بەدڵی خۆم بنووسم، بە ڕەنگی تۆخی
خۆم بمێنمەوەو بە هیچ کاڵ نەبمەوە.

خودایە سوپاسگوزارم کە گەورەترین سامانی ئەو
ژیانەت پێبەخشیم و بەو هەموو ئەو وشانە پشتڕاست
و سەرڕاستت کردم، بە ناوی ساماندارترین ژنی دونیا
لەدڵ و وشەدا بانگت کردم، ئەرکی نوێنەرایەتی
مانگت لەسەر زەمین پێ ئەسپاردم.

# کەوتنە ژێر هێڵی سفری متمانە

لــەو ڕۆژگــارە چ پێوەرێــک دروســتە بــۆ ئــەوەی متمانــە بــە کەسـێک بکـەی و وەکـو هـاوڕێ نـاوزەدی بکەی، لەکاتێکدا کە هەموو تایبەتمەندییەکانی مـرۆڤ بــــەهۆی بەرژەوەندییـــەوە لـــە ژێـــر هەڕەشــــەی لەناوچــووندان، ئــەی ئەگــەر کەســێک بــەیانی زوو لەخــەمی لێـدانی گــەرمی دڵـت نـەبێ و بـە زەنگێـک بەخەبـەرت نـەهێنێ و لـە ناوەڕاستی ڕۆژدا دووبـارە

لەهەر کوێی دونیا بێت لەهەر کارو سەرقاڵییەکدا بێت بە مەسیجێک لە درەوشانەوەی چاوەکانت نەپرسیٚ و بەر لە نووستنی شەوانەش بەدەنگی جوانی ژیانت ئاوەدانکاتەوە شایانی ئەوەیە ناوی لیٚ بنێی هاوڕیٚ؟!
مرۆڤ دەکریٚ ئەو چاوەڕوانییەی لە دۆست و هاوکارەکانی نەبێت، بەلاّم ئەوەی لەو ڕۆژگارەدا دەچێتە ژێر پێناسەی هاوڕێی دڵسۆزو نزیکەوە، دەبێت هەڵگری ئەو خاسیەتانە بێت.

# لەسەر پردەکەی لازۆ...

کەم نووسەری ژن هەن بتوانن پردێک لەنێوان هەستی ڕاستەقینەی خۆیان بەبێ ڕتوش و ئەدەبەکەیاندا دروست بکەن، ژنانی نووسەر لەهەر کوێی دونیا بن خاڵی وەیەکچوونیان زۆرن، جودا لە هونەری زمانزانی، لە ڕاستیدا من زۆر کەم شیعری کوردی دەخوێنمەوە بێ لە شیعری کلاسیک و عیرفان

و ئەو شاعیرانەی دەیانخوێنمەوە زۆر کەمن، چونکە هەمیشە چێژی خۆم دەپارێزم و ڕێگە نادەم بە بابەتی پوچ چێژم بشڵەژێنم. لازۆ یەکێکە لەو ژنە شاعیرانەی دەمێکە بە بەرهەمەکانی ئاشنام و بەتاسەوە چاوەڕێی بەرهەمی نوێی دەکەم، من بەدڵ دەخوازم لەسەر ئەو دەقانە بنووسم کە سەرنجم دەهەژێنن و چێژم هەڵدەکشێنن، بەڵام پێموایە لەسەر نووسین و هەڵسەنگاندنی دەقێکی ئەدەبی پێویستی بە شارەزایی هەیەو من دەترسم خۆم لەقەرەی بدەم، بەڵام لە یەکێ

لە ژمارەکانی ڕەخنەی چاودێردا چاوم لەو دەقە جوانەی لازۆ هەڵەنگوت بەناوی (وێنەی ژێر پردەکە) لەگەڵ خوێندنەوەیدا چەند جار ڕامام، پێکەنیم، سەرم بڵندکرد، دەستخۆشیم لەبن لێوەکانمەوە بۆ ڕەوانە کرد کە دەڵێ:

وێنەیەکم بۆ بنێرە
بە دەستلێدانی پەنجەکانم گەرم بن
وێنەی برژانگ و چاولێکنان
وەک نیشانەی داواکردنی ماچێک

وێنەی لێدانی دڵت، توندو بەهێز
وێنەی ئەڤینێکی پیاوانەو خۆڕاگر
وێنەی شانە ڕووتەکانت
کە خەمی منیان هەڵگرتووە...

دەمەوێ بڵێم شاعیری سەرکەوتوو سەد لە سەد وێنەگرێکی سەرکەوتووە، لازۆش زۆر نەرم و ژنانە کلیکی لەسەر ئەو جووڵە ناوازانە کردووە کە زور ئەستەمە مرۆڤی سادە بیانبینێ و هەستیان پێ بکات. بۆیە وا پێدەچێ، لازۆ لەسەر پردی داهێنانە، ئەگەر

نا، نەیدەتوانی ئەو هەموو وێنە جوانانە وەرگێڕێتە سەر وشەو شیعری پێ بنەخشێنێ.

شاعیر ئەو کاتە سەرکەوتوو دەبێت کە توانی لەمپەر لە دەوری خەیاڵی خۆی هەڵگرێ و زمانیش سەرپشک کا لە هەڵبژاردنی ئەو وشانەی وەک بروسکە دێنە ناو سەریەوە، شاعیری ژن بەهۆی هەستیاری سیستەمی دەماری و هەستیاری دڵیەوە دووجار دەکەوێتە بن هەر جووڵەو وشەیەکەوە، بۆیە دەبێت هەر ڕەنگێک لە ڕەنگەکانی ڕۆحی لەجێی

خۆیدا بپارێزێت و لە تێکەڵکردنیشیاندا زۆر زۆر بە ئاگابێت.

هەروەها شیعری جوان وەکو ڕووبارێک لەزەینی مندا جێی خۆی بەجێدەهێڵێ و پاش تێپەڕبوونیشی چۆن زەوی دڕیوە تا دەربچێ ئەوهاش دڵم دەدڕێ و شەق دەکا و جێگەی دەمێنێتەوە، بەو مانایەی هەر شیعرێک شوێنەوار بەجێنەهێڵێت، ئەوا شیعرێکی سەرپێیی پووچەو قەت چاوی خۆمی پێ ئەزیەت نادەم.

هـــــەروەها نووســـــەری بەرهەمەکـــــەش ئەگـــــەر پیشەکارێکی بە ئەزموون نەبێت ناتوانێ ببێتە خاوەن عەتری خۆی، بۆیە ئەو نووسەرانەی من دەستنیشانم کـــــردوون هەریەکـــــەیان بۆخـــــۆی عەترێکـــــە و لـــــە عەترخانەکەی مندا جێگای هەیەو چێژم بەبۆنی خۆی مەست دەکا و دەیناسمەوە.

مـن پـێم وایـە ژنێـک ئـەو کاتـە دەگاتـە داهێنـان لـە ئەدەبدا کە هاوسەنگییەک لەنێوان ورەو وزەی خۆیدا ڕابگرێ، چۆن سەربازێک بە بێ بوونی ئەو دوانە

نـاتوانیٚ چـرکەیەک بـەردەوام بیٚـت. لـە نووسینیشـدا هـەمان دوانە پیٚویستن، چونکە زۆر جار وزە هـەیە بۆ نووسین یان بۆ دۆزینەوەی وشـەیەکی ڕاکیٚشـەر، بەڵام ورە ئەوەندە لاوازە کە دەبیٚتـە هـۆی مـردنی وشـەکە، بۆیە لە دەقەکانی لازۆدا هەست بە هـەمان هـاوسـەنگی دەکــەم.. چــونکە ئەگــەر دەقیٚــک کۆمــەڵیٚک وشــەی وزەبەخشـی تیٚـدا نـەبیٚت لـەناو ویٚنەیـەکی جوانیشـدا بیٚت زەینی خویٚنەر ناهـەژیٚنیٚ..

من بەدڵ خۆشحاڵ و تژی لە وزە دەبم کاتێک بەرهەمێکی باڵای نووسەرێکی ژن دەبینم، کە دەتوانم بیخەمە ژێر ناونیشانی تێکستێکی داهێنەرانەی هاوچەرخ لە دونیای ژنێک، چونکە ئێستا سەردەمێکە دونیای ژن لە هەموو دونیایەکانی تر لەژێر هەڕەشەی شێواندن و لێک هەڵوەشاندنەوە دایە، بۆیە ئەگەر ژنێکی نووسەر نەتوانێ لە بەرهەمی خۆیدا ئەو ئاماژانە بە ئەدەب گێڕی، ئەوا ئەستەمە ناوی بەری بە (نووسەرێکی هاوچەرخ) و خاوەن دەقی داهێنەرانە..

ژنان لە سەرەتادا زۆر بە گەرمی دێنە ئەو مەیدانە، بەڵام پاشەکشێ یان بەپاشکەوتنیشیان بە هەمان خێراییە، بۆیە لازۆ بە یەکێک لەو ژنە بەتوانایە دەبینم کە نە پاشەکشێی کردووە نە وەپاشیش کەوتووە، ئاوێنەئاسا هەستی ژنێکی هاوچەرخ نیشانی خوێنەرانی خۆی دەدا..

یەک لەدیوەکانی هەڵوەشاندنەوەی دونیای ژنان ئەو ئەدەبە بازرگانییە بەدەڵەیە کە بەناوی داهێنان لە چەند فۆرمێکی ئیرۆتیکی بەناو عەشقدا، شوناسی

ژنی نووسەری ئەو سەردەمەیان بە خۆیانەوە لکاندوە، بۆیە هەر لەکوردستان نا لە هەموو دونیا، ژنان بە پۆل ناوبانگی شاعیری و نووسەری بەخۆیانە هەڵدەواسن و بەڵام ئەوانەی وەکو دەنگی سەردەم زمانی خۆیان دادەڕێژن و زمانیان دەبێتە شوناسیان لەهەموو کۆمەڵگەیەکاندا بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن.

بۆیە بە ڕای من ئەگەر نووسەر دەقێک بەرهەم نەهێنی کە ڕاستەوخۆ زەین و دڵی خوێنەر نەسمێ

........................................................................................................

ئەوا ئەو بەرهەمە دەكەوێتە ڕێزی هەموو شمەكە یەك جار مەسرەفەكانی ئەو سەردەمە و لە ڕۆژێكدا وەكو هەموو پاشماوەكانی دی كۆدەكرێتەوەو فڕێدەدرێ، لەژێر ڕۆشنایی هەمان دیددا دەڵێم، بەرهەمی لازۆ نەبۆتە ئەو پاشماوەی كە بەسەربچێ خوێنەر بۆی نەگەڕێتەوە، هەروەها كەسایەتی لازۆ خۆشی دەكرێ وەكو كەسایەتی ژنێكی نووسەری هاوچەرخ پێناسەبكرێ، چونكە تێكەڵەیەك لەخاسیەتی هەمەڕەنگی ژنانەو تەنهابونانەی كە

دووره لــه نووســەری گشــتی لەخۆیــدا پاراســتوەو هەوڵیداوە نە بۆخۆی نە تێکستەکانی بچنە خانەی یەک جار مەسرەف و گشتیبوونەوە.

من دونیایەک خۆم بەدوور دەگرم لە پێهەڵگوتن و ڕازاندنەوەی هەم دەق و هەم ناوبانگی نووسەرانیش بەهەزارەها پەرژین چێژی خۆم دەپارێزم لە کاڵبوونەوە، زۆر بە تەقیەوە ڕای خۆم دەردەبڕم لەسەر دەق و نووسەران نەوەکو بکەوێتە بن سێبەری خۆشەویستی هاوڕێیەتی و بەرژەوەندی دوو دیوی

پەیوەندی، بۆیە ئەگەر تێکستێک، شیعرێک ناوی خۆمم لەبیر نەباتەوە ئەوساتەی دەستی بۆ دەبەم و دووسێ جار لەسەریەک نەیخوێنمەوە و دەستی بەسەردا نەخشێنم و بەرامبەری نەگریەم و بزە نەگرم و نەزیرکی ڕانەگرم لە سینگم، هەرگیز نە ڕای لەسەر دەدەم نە دەتوانم وشەیەکی لەسەری بنووسم.

کاتێک لازۆ دەنووسێ (ماچێکت بە هەموو عەرشی ئیمپراتۆرەکان ناگۆڕمەوە) مرۆڤ ناتوانێ دان بەبوونی ئەو هەڵدێرە قوڵەدا نەنێت کە ژن تێی

دەکەوێ ئەو کاتەی عاشق دەبێت، ئەو دەمەی دەنووسێ (دیسان بێدەنگ، دەڕژێمە سەر جێگایەکەم) ئاماژە بە سەدان جار ڕژانی ژن دەکا لەکاتی عاشقبوونیدا، لەپشت ئەو ڕژانە، ڕژانی چاو، ڕژانی ڕۆح و ڕژانی دڵ هەیە، بەڵام ئەوانە دەبنە هێما بۆ ڕژانی شکۆی ژنێک کە مەترسیدارترین ڕژانە کە بەشی هەرە گەورەی ئەو ڕژانە، ڕژان لەسەر جێگایە کە هەزارەها برین و ورتکە برین بەجێدەهێڵێت.

له دونیای پڕ پێكدادان و جه‌نجاڵی ئه‌مڕۆدا ئه‌گه‌ر نووسه‌رێك زۆر به‌زیتی و به‌ هۆشیارییه‌وه‌ نه‌توانێ ببێته‌ پردێك له‌نێوان ئه‌و وشكهه‌ڵگه‌ڕانه‌ ڕۆحیه‌ی مرۆڤی ئه‌و سه‌رده‌مه‌دا به‌سه‌ری هاتووه‌ له‌گه‌ڵ تاڤگه‌یه‌ك له‌ وێنه‌ و وشه‌ و نیگاری ته‌ڕ و ساده‌ی مرۆڤایه‌تی ئه‌وا حه‌تمه‌ن به‌ نووسه‌رێكی باو دێته‌ژماردن و به‌جێماوه‌.

به‌تایبه‌ت دونیای ژنان له‌و سه‌ده‌مه‌دا جۆره‌ها لقی پیشه‌سازی لێ دروست كراوه‌ بۆته‌ ژیله‌مۆیه‌كی

بنەڕەتی سەرمایەداری بۆ بەکارهێنانی ناو و جەستەو زمانی وەکو کەرەستەیەک لەکەرەستەکانی بەرهەم و بازاڕ، لەبەرئەوە ئەرکی سەرەکی نووسەری ژن پاراستنی ڕۆحی خۆی و بەرگری کردن لە تایبەتمەندیەتی خۆی بۆئەوەی نەهێڵێ ڕۆحی ببێتە ڕۆحێکی ڕۆبۆت و سەرمایەداری هەڵیسوڕێنێ، لە ڕێگەی شیعرو نووسینەوە بتوانێ پردی پێویست لەنێوان خۆی و خوێنەردا ڕۆبنێ، بۆیە بەڕای من ئەرکی نووسەری ژن ئەرکێکی دووبەرە بەتایبەت

ئەگــەر خواســتت بێــت بــە یــەک لــە نووســەرە چــێژ پارێزراوەکان بمێنیتەوە.

ئەوەی پتر جێی سەرنجە، هەستەکانی لازۆ هەستی سروشتی ژنێکن ئەو هەوڵی مۆنتاژکردنی هەستەکانی نەداوە تا خوێنەر بەلارێدا بەرێ سەرەڕای ئەوەی ئەو لــە تەمــەنێکی منداڵییــەوە لــەدەرەوەی کوردســتان ژیاوە، بەڵام دەبینی پچڕانێکی کولتووری لـە ناخیـدا ڕوینـەداوە هــەروەها هەسـتەکانی بـە بۆیـەکی تـەواو ڕۆژئاوایی نەڕەنگاندون، بەو مانایەی هاوسەنگییەکی

لە نێوان ژنبوونە کوردی و ژنبوونە ڕۆژئاواییەکەیدا دروست و مرۆڤانە ڕاگرتوە.

بەهەمەحاڵ، لازۆ تاقەتی بەوە شکاوە پۆلێک خوێنەری جوان بۆخۆی ماڵی بکا وەکو ژنێک هاوشێوەو هاوهەنگاوی پشوی (با) هەمیشە هەڵنەکات و هەمیشە دەستەبەر نەبێت لەناو ژاوەژاوەکانی بەناو داهێنان و فیستیڤاڵ و خەڵاتی کوردیدا و بەدوور بێت لە باوەکانی ئەو سەردەمە. بۆیە بەدڵ ئومێد دەکەم بتوانێ هەموو ئەو

تایبەتمەندییانـەی بـۆ هەمیشـە بپـارێزێ و لەسـەر هەمان پرد بڵند بڕوانێ و قووڵ لە ژێر پردەکە بڕوانێ تا هەزارەها وێنەی شاراوەی تری جوان بگرێ و بە سەدان کانی شیعری لێ هەڵبوقڵێت.

# دڵ بە سنووری دونیا

مرۆڤ هەن سنووری دڵیان دەهێندەی سنووری دونیایە، هەروەها مرۆڤ هەن سنووری عەقڵیان دەهێندەی سنووری دونیایە، عەجەبا چۆن مرۆڤ ئەو سەنگەی هەیەو بتوانێ ئەو هێزە لەناو خۆیدا هەڵگرێ؟! من دڵنیام هەڵگرتنی ئەو هێزە نە بەسامانی دونیایە، نە بە نازناوی دەسەڵاتە نەبە پێشگری زانست و نە بە پاشگری خانەوادەیە، ئەو هێزە تەنیا بە بڕوا بەخۆبوونە. بۆیە نەمری شایستەی دڵ دونیایەکانە نەک شایستەی دڵ دوکانەکان.

## مانگ وەکو تاکە هاوڕێ ..

مـانگ کـۆنترین هـاوڕێ و تاکـە هـاوڕێی منداڵیمـە، هاوڕێیـەکانم هەنـدێک خـودا بردنیـەوە و هەنـدێکیش ژیـان بـردنی، لـەمانگ زیـاتر کەسـی نزیکتـرم نییـە، لەهەموو شتێک زیاتر لەمانگ ڕا دەبیـنم، هـەتا چـاوم پێـی نەکـەوێ واز لـە ئاسمـانێ نـاهێنم، هـەر مـانگ بێ بەرامبەر ئارامی و سۆزم پێدەبەخشـێ، مـانگ دەزانێ چۆن نازم بکێشێ چۆن بەبێدەنگی تەماشام بکا، ئەو

دەمانەی دڵم تەم دەگرێ چاوم لەبینینی ئەو هەموو ساختەکارییەی ژیان سۆمایان دەشکێ، بە سەعات بەرامبەری مانگ دادەنیشم، مانگ هەرگیز دڵی لە جێ دەرنەچواندوم، بەجێی نەهێشتوم، چاوی هەڵنەخەڵەتاندوم، بۆیە دڵنیام تاکە هاوڕێیە کە نە پەشیمان دەبمەوە نە هەتا هەبم لێی پاشگەزدەبمەوە..

## تەنیایی چەند دروستکەرە
## هێندەش پڕوکێنەرە...

دەکرێ بڵێین مرۆڤ لەهەموو شتێک زیاتر لە تەنیایی دەترسێ چ هەوڵی هەیە دەیخاتە کار هەر هەتا لەتەنیایی ڕزگاری بێت، ئەگەر دەسەڵاتی هەبووایە مەرگیشی ڕەتدەکردەوە، چونکە بەتەنها دەڕوا، بەڵام هەموو ئەو مرۆڤانەی لەژیاندا گەیشتوونەتە پلەیەک لە عیرفان و داهێنان ئەو

مرۆڤانە بوون کە هەموو ژیانیان گشتی نەبووەو جۆرێک لەخەڵوەتنیشیان پەیڕەو کردووە هەر لە پەیامبەران و عارفان و زانایان و سوڵتانەکان هەتا بیرمەندو شاعیرو هەموو فەیلەسووفە داهێنەرەکان، لەخەڵوەتی تەنهاییدا پێگەیشتوون، کە لەسەردەمی مودێرنەشدا ئەو خەڵوەتە ناوی بۆتە ئۆفیسی تایبەت یان ژووری کار بۆ هەموو ئەو مرۆڤانەی داهێنەرن.

# وەستای نووسین و
# شاگردی نووسین...

نووسین نە بانگەشەی پێویستە نە جوانكاری، نە جەماوەر نە پاوانكاری، ئەوانەی وەستای نووسینن هەرگیز بەو ئامانجە پێنووس هەڵناگرن، چونكە لەناخەوە بەبێ ڕەزامەندی خۆیان نووسینیان بەسەردا دەسەپێ، بەبێ ئەوەی چاو زۆر بگێڕن دەستیان لەدەستیان بئاڵقێ و خۆیان ڕاگوشن و زمانیان بدۆزن، بەڕیز وشەی جوان لەسەر یەك

دادەنێن و وەستایانە چیان مەبەست بێت دەیپێکن، بەلاّم ئەوانەی شاگردی نووسینن، بەزمان و بە خواستی جەماوەر دەنووسن، ورد ورد لە ڕێزمان و خاڵبەندی و ئەو سەر نووسەری ڕستە سەرنج دەدەن، وشە کۆدەکەنەوە، وشە هەڵدەگرنەوە، وشە دەشارنەوە، وشە دەستبەسەر دەکەن هەتا ڕستەیەک دروست دەکەن، دەرئەنجام شاگردەکان نووسین خەوشدار دەکەن چ ناوبانگ یان پارەی پێ پەیدابکەن..

# پۆست سامانداری کوردی

مێژووی ئەدەبی کوردی پڕە لە نموونەی دەردەسەری شاعیرانی هەر لە شاربەدەرکردنیان و لەنرخ کەمکردنەوەیان.. بۆیە زۆر سەختە بۆ نەتەوەیەک کە خاوەنی ئەو فەرهەنگە بێت لە ئێستادا ستایشی ئەدەب بکات و شیعر نووسین بە خەوش نەزانێت، شاعیرەکانی نەکاتە بابەتی قۆشمەبازی، زۆربەی ئەوانەی ئەورۆ لەسەر شانۆی سیاسی ئەو وڵاتەن باکگراوندی خانەوادەییان دەگەڕێتەوە بۆ

مەلاو شێخ کە کەم مەلاو شێخی کوردوستان هەیە شیعری نەنوسیبێ یا کۆی دیوانە کلاسیکەکانی ئەزبەر نەبووبێت، بەڵام نەوەی ئەورۆ کە بە پۆست ساماندارى کوردی دەژمێردرێن لە شانازیکردن بە سیاسەت و بزنسەوە نەبێ هیچی تر خواستیان نییە، هەروەها لەکاتێکدا چەندین وەزیرو سەرەک وەزیرانی دونیا ئەدیب و شاعیرن، تائێستا بۆ کوردان هەر ئەدەب و فیکر لاسەنگە بەرامبەر بزنس و سیاسەتمەدار.

# ٢٠١٤ خەڵات دەکەم ...

دەبێ لە دڵڕا خەڵات و سوپاسی ساڵی **٢٠١٤** بکەم، کە نەیهێشت ببمە کۆیلەی داعشەکان، گیانی پاراستم لە توشبوون بە سەرەتانە کوشندەکان، بەنابەدڵی ناوی نەخستمە تەنیشت ناوی پیاوێک، پڕ بە دڵی خۆم شایستەی بەتەنهابوونی کردم، بەبێ عەشق ناوی لەپشتی ناسنامەی پیاوێک نەنووسیم، بە زۆرەملێ

نەیکردمە شارەوانی خێزان، دەبەنگانە ژنێکی وەکو خۆمی پێ نەکردمە خزمەتکار، پێنووسەکەی پێ شۆڕنەکردم، بە ڕەنگە گەرم و ژنانەکەی خۆم وەک ڕووبار ڕێڕەوی کردم و لە بوون بە بەنداوی دەستکردی بەدووریخستم.

## دانیشتن بەهەموو تاقم و تەدارەکەکانییەوە...

هیچ شتێک هێندەی دانیشتن و دەردەدڵ هەڵڕشتن لەگەڵ هاوڕێ و دۆستی ئەزیز مرۆڤ دڵخۆش ناکا، هەرهەموو ئەوانە دەچنە بازنەی هونەری پەیوەندیکردنەوە زۆریش کاریگەرن، بۆنموونە مرۆڤ هەن زۆر سەرکەوتوون لە خڕکردنەوەی

چەندین برادەر لە دەوری یەک، یان مرۆڤ هەن بەناوبانگن لە مەجلیس خۆشی، یان مرۆڤی وا هەن لە گوفت شیرینی دا بێ هاوتان، بۆیە هەموو زانستە سایکۆلەجیەکانیش سەلماندویانە کە پەیوەندی هاوڕێیانەی گەرموگوڕ وەکو دانیشتنی زۆر لەدڵەوە کاتێک مرۆڤ لەگەڵ قسەکردن دەست لەدەستی هاوڕێیەکەی دەخشێنێ و دەست لەسەر شانی دادەنێ و سەیری چاوەکانی دەکا گەورەترین تیمارکردنی

دەروونییە و دەبێتە هۆی ڕسکانی بیرۆکەی نوێ و دەربازبوون لە داهێزرانی ڕۆحی، ئەوجار ئەگەر ئەو دانیشتنانە بە چێژتر بن دەبێت حەتمەن پڕ بن لە چایە و قاوەی تایبەت و هەموو ئەو تەدارەکانەی بۆ حەسانەوەی دەروونی پێویستن دەبنە هۆی هێورکردنەوە و گەرمکردنی دانیشتنەکان، بۆیە ئەگەر ژیانت چواردەور نەدرابێت بەو دانیشتنە پڕ تەدارەکانە، ئەوا بە ساردی مردووی...

# تێکەڵەیەک لە ژنبوون ...

بوون بە ژنێکی هاوچەرخ لەو سەردەمەدا یەکە لەگەورەترین چەلەنگەکان، ئاخر لەو سەردەمی تیژڕەوی زانیاری و مەعریفەو گوڕانکارییەدا چەند ئەستەمە ژنێکی چەلەنگ بی، لەیەک کاتدا تێکەڵەیەک بیت لە ڕۆشنفیکری و ڕۆشندڵی و ڕۆشندەستی، ژنێک بیت دەستڕەنگین و زمان ڕەنگین و بیر ڕەنگین، هەم

بەرهەمی کارت بدەیتە کۆمەڵگە، هەم بەرهەمی کارت بدەیتە خێزان، هەم ژنێکی ڕەسەنی خاوەن بڕیار هەم ژنێکی مۆدێرنی لەگۆڕاندا، بەرگریکەر لەو شەپۆلە گەورەیەی سەرمایەداری و کۆمەڵگە بۆ دەبەنگکردنی ژن نەخشی دەکێشی، چ قوربانییەکی دەوێ، بۆیە ئەگەر تێکەڵەیەک نەبی لە ژنبوون لەو سەردەمەدا بەدوادەکەوی و بەرگەی هەڵگرتنی ناوی خۆشت ناگری...

# بەناوبانگ بوون لە ساڵی ٢٠١٤

سەدەو ساڵ و سەردەمەکان پێوەری خۆیان هەیە بۆ هەر کارێک بۆ هەر مرۆڤێک تا ناوزەدی بکەن بە هەڵکەوتەو بەناوبانگ، دیارترین پێوەرەکانی ساڵی **٢٠١٤** بۆ بەناوبانگ بوون ئەوانە بوون، دەبێت لە ئەکاونتی تویتەرەکەت زیاتر لە پەنجا ملیۆن فۆلۆت هەبێت، ڤیدۆکانی یوتیوبەکەت لە پێنجسەد ملیۆن

تەماشـــاکەر تێیپەڕانـــدبێت، خـــاوەن کتێبێـــک بێـــت گەیشتبێتە ئاستی باشترین کتێبی ساڵ و زیاتر بۆ سی زمـان وەرگێڕدرابێـت، سـەرمایەکت کۆکردبێتـەوە لـە سـەد بلیـۆن دۆلاری تێپەڕانـدبێت، پاڵـەوانی فیلمێـک بـووبی کـە لەهەفتەیـەک نمایشـدا زیـاتر لـە دووسـەد ملیـۆن دۆلاری وەدەسـتهێنابێت، سیاسـییەک بووبیـت دیارترین ڕۆڵـت لـە هەڵگیرسـان و بـەرگری لـە شـەڕی تـیرۆردا گێڕابێـت، ژنێـک بووبیـت لـە وێنـەی کـیم

کارداشیان، ملیۆنان کامێرات بۆ سەر جەستەی ڕووت و وروژێنەرت بۆ بازرگانی ڕاکێشابێت، ئەگەر لەو پێڕانە نەبی ئەوە نە بە کەسایەتی ساڵ ناسراوی نە جێگای شانازی و تێپەڕاندنی پێوانە مۆدێرنەکانی.

# ساڵێک بە ڕەنگی ڕەش

**٢٠١٤** داعشی هێنا بەدیاری بۆ دونیا، داعش ترۆپکی توندوتیژییەکانی ژیانی لە چەند مانگێکی تەمەنیدا ڕاگەیاند، لەو ساڵەدا داعش بەچەند ڕەنگ خۆی پیشاندا، لەهەموویان ئازاردەرتر **٤٠٠٠** ژنی کوردی یەزیدی بە کۆیلە برد، جۆرەها بەچکە داعشی دروستکرد، جۆرەها کۆپی داعش ڕەواجی پەیداکرد، بەهەزاران سێبەری داعش خۆی بەدەرخست، داعش

ئـەو کولتـوورەی **٢٠١٤** سـەدان لقـی لێ جودابۆتـەوە، لەناوخۆ خرتوخاڵـەکانی داعـش دەمامکـەکانی ڕووی خۆیان دەرخست، نازانم **٢٠١٥** چـیدیکە لەگـەڵ خـۆی دەهێنیٚ چ ناوو ڕەنگێک لە خۆی دەنێت..

# پیتچنین و فیکرچنین ...

چـنین دەکـرێ بـە وشـەیەکی مانـا دووبـەر لێـی بڕواندرێ، بـەرێکی بـە مانـای پێکـەوە لکانـدنی چـەند کەرەستەیەکی یەک توخم یا لێک جودا لە قەبارە و لە ڕەنگدا بۆ دروستکردنی شمەکێکی چاکتر، جـوانتر یـا پتـەوتر دێـت، یـا ئەگـەر شمـەکێک زەرەردار بووبێـت وەکو خاران یا کون بوون یا سوان ئەوا بـــەچنینەوە

دەپارێزرێت، بەرێگایەکی دیش بۆ جوانکردن بە هەویای دروستکردنی شمەکێکی نوێ لە چاوان خۆشترو ڕەنگینتر.

بەری ئەودیوی مانای وشەی چنین بۆ چنینەوەی میوەو ڕووەک دێتە گوتن، ئەویش ئەو کاتەی بەری درەخت پێدەگات و باخەوان هەڵدەستێت بە ڕنینەوەی بەری درەختەکان وەکو ترێ چنین و هەنار چنین، هەروەها بە لەسەریەک دانان و ڕازاندنەوەی

میوەی هەمەجۆرو گوڵی هەمەجۆریش دەوترێ چنین.

ئەوەی جێی سەرنجە یەک لەسەرە تولەکانی وشەی چنین ڕەگی هاویشتۆتە ناو بابەتێکی گەلێک گرنگ ئەویش پیتە و ناوزەدکراوە بە پیتچنین ..

پیتچنین بە مانای پێکەوە لکاندنی چەند پیتێک دێت بۆ دروستکردنی وشەیەک کە دەکرێ بە هەنگاوی سەرەتایی بۆ مێژووی فیکر و مەعریفەو زانست بهێتە ژماردن، چونکە پێش ئەو پێکەوە لکاندنە ناتوانرێ

هیچ مانایەک دەستنیشانبکرێ و ئاماژە بە تێگەیشتنی بدرێ، لەبەرهەندێ هەتا قوولتر سەرنج لە وشەی پیتچنین بدەین زۆرتر دەحەپەسێین، بەڵام ناوکی ئەو کارە ئەرکی هەموو کەس نییە، بە مانایەکی دی ڕۆژێ بە ملیۆنان مرۆڤ بەشدارن لەناو پرۆسەی پیتچنین، ئەمما بە دەگمەن نەبێت هەموو ناتوانن شێوە فیکرێک بچنن کە بە فیکر ناوزەدبکرێ و ببێتە جێگای ڕاچڵەکان و تێهزرین و گۆڕان و وشەی چارەنووسسازی لێ دروست بکری ... بۆیە دەکرێ نازناوی پیت لێکدەر بەو مرۆڤانە ببەخشرێ، کە تەنها

پیتەکان لێکدەدەن بە بوونی داهێنان و زیندوو ڕاگرتنی وشە و چنینی وشەیەکی پڕ مانا...

لەگەڵ ئەوەش پیتچنین کارێکی هێندە وردو هەستیارە کە سەنعەتکاری کارامەی پێدەوێت تا بە دوور بێت لە هەڵقرچان و هەڵدروونی وردتکە مانای وشەیەک پێش بەرهەمهێنانی و سازدانی..

وشە چنین کارێکە هەتا دەزووی بۆ شل کەی پێوەدەڕوا و بەبەریەوە هەیە فیکری گەورەی لێ بەرهەم بێت بەو مانایەی دەکرێ لە وشەیەکی ناوک

وشەیەکی دی و مانایەکی دی دابتاشرێ یان بە لکاندن و کەمکردنەوەی پیتێک مانایەکان بگۆڕێن و بەراوەژوو بکرێنەوە...

وشە چنین ئەگەر فیکری لەپشت بێت، دەکرێ بەهەموو دیواندا فیکر بوروژێنێ و قازاختر فیکر بچنێت و چێژ ببەخشێتە خوێنەرو پەل بە فیکرو تێڕوانینی خوێنەر بهاوێ، هەروەها وشەچنی زیت و شارەزا دەتوانێ بە وشەی زۆر ڕوون فیکریش وەکی قوزاخەیەک بچنێ و بە ڕوونی و بە ئاسانی

مەبەستی بگەیەنێتە خوێنەر بە پێچەوانەی ئەوەی بە وشەی قەبەو زبرو تێکچرژاو چێژی خوێنەر بشێوێنێ و خوێندنەوەو فیکری لەبەرچاوان..

ئەمن بە دڵنیاییەوە پێموایە، ئەو ڕۆشنبیرانە هەمیشە بەرەو نهۆمی باڵا هەڵدەکشێن ئەو ڕۆشنبیرانەن کە لە وشە چنیندا زۆر سەنعەتکارێکی شارەزان، زۆریش بە تەقیەوە وشەبازی دەکەن لەئەنجامی تێکهەڵچنینی وشەکاندا هەزارەها وشە نەمر دەکەن، ڕوونتر بێژم هەندەک وشە هەن

وەختێک دەچنە ناو ڕستەیەکی ناوازە ئەوا ڕاستەوخۆ لە زەینی هەزارەها خوێنەردا دەچەسپێن و هەروەها چەندبارە بەکاردەهێنرێنەوە لە دەقی جیاواز جیاوازدا ..

کۆی سەرنجەکانم وا دەنوێنێ ئەگەر ڕۆشنبیر خەسڵەتی وشەچنی تێدا نەبێ ئەو لە ئاستێکدا چەق دەبەستێ و ڕێی تێدەچێ ببێتە هۆی هەڵپاچین و سڕکردنی وشەو بە هیچ شێوەیەک ناتوانێ ببێتە فیکرچن و بە تیژڕەوی گۆڕانکارییەکانی دونیا فیکر بچنێت.

# خووە شیرینەکانی خۆم

لەشێوەی ڕووبار بێ ڕەوت دەڕۆم و مل لێدەنێم، وەک پۆلە پەپوولە بەدەوری یەک وشەی شیریندا دەجار فڕەفڕ دەکەم، هەرچی هەڵە و ناهاوسەنگی ئەو ژیانە هەیە بەملی تۆی دادەهێنم، تەنهاییە مزرەکەم بە خوێندنەوەی شیعرێک دەلاوێنمەوە، ڕۆژێ چەندجار چاوەکانم بۆ پێنووسەکەم

دادەنەوێنم، لەبری تۆ دەجار دەچم بەرامبەر ئاوێنە ڕادەوەستم، جووتە گوارەیەکی شۆڕ لەگوێ دەکەم، خۆ ئەگەر چەندین مایلی دیکەش دوور بی، هەر شەڕە چاو لەگەڵ تۆ دەکەم، لەبەر تاڵییەکانی ئەو ژیانە هەمیشە ناوی تۆ وەکو نوقڵی ترش و شیرین لەناو دەممدا دێنم و دەبەم، سەر بەسەری ڕۆژنامەکاندا دەگرم، شانبەشانی مانگ بەدەوری زەویدا دەسوڕێمەوەو خول دەدەم..

## لەندەن نیشتمانی دووەمم

لەندەن پێموایە لایەکی لە جۆگرافیای دڵم وەبەرخۆی هەڵبڕیوە، لەندەن غەریبیم ڕوونترو جوانتر دەکا، هەمیشە سەبوریەکی پێیە بۆ بەهانەگیرییەکانی من، نازانم نە ڕووبارەکانیم ماڵی کردوون نە ڕووبارەکانی منیان ماڵی کردووە، شەقامێ نەماوە باوەشی بۆ نەگرتبمەوە، بە دڵ لەگەڵ

ئەسپەکانی دەئاخفم و دەگریەم و پێدەکەنم و پیاسە دەکەم، درەختەکانی بە سێبەرو بە گەڵاو بە هێلانەو بە چۆلەکەکانیەوە دڵیان لاواندومەوە زۆر زیاتر لە مرۆڤەکان لەو ژیانەدا.

چەند دەترسام لە هەبوونی نیشتمانی دووەم، چونکە پێموابوو لەناوخۆیدا بزرم دەکا، سیحرم لێدەکا، بڵێسەی کوردستان لەناو دڵمدا خامۆش دەکا، بەلاّم لەندەن ئەوەندە نازدارە هیچ وەخت بە زۆرەملێ خۆی بەسەر کەسدا ناسەپێنێ، هیچی

ڕەسەنیشت لێ زەوت ناکا، ئەو نیشتمانەم چرایەکی جوانە دونیای مەعریفیم ڕووناکتر دەکا، ئارامییەکی بێ سنوورو بێ بەرامبەرم پێدەبەخشێ، هەمیشە لە لەندەن هەست دەکەم ژنێکم پێکەوە بەستراو هیچ شتێک دابەشم ناکات.

بۆ یەکەمجار لەژیانمدا لە لەندەن هەستمکرد، وەکو ژنێک نا وەکو مرۆڤ ژیان مامەڵەم لەگەڵ دەکا، لەبەرئەوەی ژنم ڕەنگێکم ناشێوێنێ، دەنگم کز ناکا.

# پەنجاو دووەمین هەفتەی ساڵی ٢٠١٤

ئەو هەفتەیە پەنجاو دووەمین هەفتەی ساڵە، ئەگەر ئەو ساڵە توانیبێتی، پەنجاو دوو قاقای لەدڵڕام پێ لێبدات، پەنجاو دوو دڵ بە من خۆش کا، پەنجاو دوو هەنگاوی جوانی بە من هەڵێنا، پەنجاو دوو کاری خێرم پێبکا، پەنجاو دوو لێو بە هیوای من بزە تێخا، پەنجاو دوو دوعای پاک بۆ پاراستنی کوردستانم پێبکا، پەنجاو دوو باوەشم لە منداڵە هەتیوو و لێقەوماوان پێ گرێبدا، پەنجاو دوو جار دەستمی بۆ

ئاماژەدان بەڕاستی هەڵهێنا، پەنجاو دوو جار هەرچی حەسوودو دوژمن و پیلانگێڕی دەورەی منە هەرەسی پێهێنا، پەنجاو دوو ڕستەی جوانی لەژێر ناوی من دانا، دیداری پەنجاو دوو هاوڕێ و دۆستی ئازیزی بۆ من ڕەخساند، پەنجاو دوو کتێبی ناوازەی بە چاوەکانم نیشاندا، ئەوا بە هەموو تەمەنم قەرزباری ئەو پەنجاو دوو هەفتەیەم و شوکر بۆ خودا کە ئەو نیعمەتە گەورانەی بە مندا ...

# مرۆڤ وەکو بگۆڕێکی مۆدێرن

جـودا لـە هــەموو ئامێرەکـانی تـری تـەکنۆلۆژیا مـرۆڤ ئـاڵودەبوونی بـۆ تەلـەفۆن زیـاترە، ئەگـەر لەمێـژووی تەلـەفۆن بڕوانین، ئـەوا تەلـەفۆنی گشـتی پاشـان تەلـەفۆن لەڕێگـەی بەدالـەوە پاشـان تەلـەفۆنی دیجیتاڵ لەڕێگەی ژمارەی تایبەتەوە، پاشان تەلەفۆنی گەڕۆک مۆبایل، لەو ساڵەدا ئەوەی بە ئاشکرا دەبینم

بچووک بوونەوەی مرۆڤەکان بوو لەناو مۆبایلەکانیاندا، چونکە جۆرەها ئەپلیکەیشنی وەک (ڤایبەر، سکایپ، ئینستاگرام، تانگۆ) هەموو خولیاو پەیوەندی و خەونەکانی مرۆڤ ڕادەکێشنە ناو تۆڕەکانی خۆیان، تەکنۆلۆژیا هیچ هەناسەو هیچ تێڕوانینی جوانی بۆ مرۆڤ نەهێشتۆتەوە، هەتا گرنگترین هەستەکانی کە هەستی سۆزداری لێی کردونەتە دیجیتاڵ، مرۆڤی ئەو سەردەمە بەدالەیەکی قەرەباڵغە بۆ وەڵامدانەوەی داواکاری و حەزو پێشنیارەکان جۆرەها پەیوەندی

وەڵامدەداتــەوە و دروســتدەکا، وەکــو ڕۆبــۆتێکی قورمیشــکراو ســەری هــەر لەســەر تەلەفۆنەکەیــەتی بەشــێوەیەکی ئالوودەبووانــەتر لــە تریــاک، ئەگــەر سەعاتێک خەت نەمێنێت ئەو ئۆقرەی نامێنێت، لە مێوانداری لەکاتی شوفێری، لەسەر نانخواردن لەسەر کارکردن بۆتە کۆیلەی ئەو پەیوەندی و بازاڕو یارییە دیجیتاڵە خەیاڵییانەی ناو تەلەفۆنەکەی، بۆیە ئەو مرۆڤــە زیــاتر لــە بەدالەیــەک هیچــی تــر چــێژی بــۆ نەماوەتەوە لەژیاندا، ئەو مرۆڤە مۆدێرنە تازە بۆتە

بـــــازارێکی دیجیتـــــاڵی قـــــەرەباڵغ لەڕێگـــــەی تەلەفۆنەکەیەوە هەم کەلوپەل دەکڕێت هەم کەلوپەل دەفرۆشێت هەم بۆخۆشی بۆتە کەلوپەل، بۆیە وەکو بەدالەیەکی مۆدێرن تەنها پارەی پێ پەیدادەکرێ ..

# هاوهەنگاوی کەی ڕوودەدا؟

سابیر هاکا دەڵێت (شیعر بیانوێکی باشە کە نامبەنە شێتخانە) منیش دەڵێم (شیعر تاکە بیانوو بوو کە لەشێتخانە دەریهێنام) من چونکە دەسەڵاتم بەسەر دڵدا نەماوە و دڵم ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی کاروباری شیعریم دەکا، دڵم بەبێ پرس و ڕوخسەت جووڵە بەزمانم دەکا، بۆیە هەر شیعرێک ڕاستەوخۆ دڵ

نەهەژینێ چاوەکانم بڕیاری خوێندنەوەی نادا، ئەوڕۆ سابیر هاکام خوێندەوە، ئەی چەند سەرسام بووم بەو هەموو نیگارە جوانانەی نەخشاندونی، بەبێ ئەوەی ئاگام لێ بێت چەند جار ڕایانکێشامە تاران، نامەوێ ئەوە بچێتە ڕیزی خۆهەڵنان، بەڵام چۆن سەرناسم ئەوهاش شیعرناسم، چەند دڵم خۆش بوو کە قەڵەمێکی کوردی ئەوها جوان بۆتە هاوقەڵەمم، بەبێ وشەسەپاندن وشە دەڕێژێ وشە ڕەنگین دەکا، ئەی خودایە چەندە جوانە مرۆڤ بێ دەمامک

بنووسێ و بێ لەمپەر بیربکاتەوە، ئەوە من بووم، بەڵام نازانم لێرە بەدوا قەڵەمەکەم چۆن بەخێرهاتنی هاکا دەکا...

# نووسەر وەکو مارکە...

مرۆڤ کە سوا تاکە شانازی دەبێتە لۆگۆ، ئەوەی لەو چەند ڕۆژانەدا زۆر ئەزیەتی دام، ئەو پۆستانە بوون کە شانازیکردن بە لۆگۆی دەزگای بڵاوکردنەوەیەک بوون لەسەر کتێب و شکانی کەسایەتی نووسەران و ڕاگەیاندنی خۆیان وەکو مارکەو پرۆفیشناڵ لە کارەکانیاندا، من دەمێکە گومانم لەوە نییە کە زۆربەی دامودەزگا فەرهەنگیەکان کۆپی دامودەزگا حکومیەکانن و بەشدارن لە ڕوشانی کەسایەتی و شکۆی نووسەران.

هەندێک لەو نووسەرانە خۆیان بەبن سێبەری حیزبێک داوەو لەناو دەزگا فەرهەنگیەکانی ڕا ناوی خۆیان بە مارکە دەزانن و پۆزی پڕۆفیشینالّی لێدەدەن، من دلّنیایان دەکەمەوە ئەگەر ئەوان هێندە بلّندن خوارەوە نابینن بایی ئەوەندە خەلّک ماوە لەو کوردستانە، کە ئەو پەیژە ببینێ کە ئەوان بەسەریدا سەرکەوتوون، ڕێزو خۆشەویستیشم بۆ هەموو ئەو نووسەرە بە شکۆیانەی ناوی خۆیان دەپارێزن لە بە مارکە بوون و شانازی بە هیچ لۆگۆیەکەوە ناکەن.

# هەواڵێری نێودەوڵەتی

یەک لە ڕووداوە هەرە دڵهەژێنەکانی ژیانم، بینینی ئەو دەستەواژەیە بوو لەسەر تابلۆی ئەلیکترۆنی فڕۆکەخانەی فرانکفۆرت لەساڵی ٢٠٠٦، لە بیرمە ئەوەندە ڕامکرد خۆم بە چەندین موسافیر دادەدا تا پڕ بە چاوەکانم لەو نووسینە بڕوانم و چەند جار لەسەر بیتاقەی سەفەرەکەم ئەو ناوەم ماچ کرد.

من دڵنیام گەلێک مرۆڤی هەڵکەوتەو جوان گیانیان بەخشی و شەهیدبوون بە هیوای تەنها بینینی ئەو دەستەواژەیە، لە بیرمە هەر سەرەتای دوو هەزارەکان زۆر کەسایەتی شارەزاش پێیان وابوو بینینی فڕۆکەخانە لە هەولێری هیوایەکە ١٠٠ساڵی تر ئومێدی هاتنە دیتنی دەکەن، بۆیە ئەو هەواڵە کە فڕۆکە لە هەولێری دەنیشێ دەستەولەعاز گەڕاندمیەوە کوردستان، ئەو ڕووداوە لەگەڵ ئەوەی گۆڕانکارییەکی گەورەی مێژوویی و ژیاری و

ئابووری بەسەر کوردستانەوە هەبوو، سەروەرییەکی گەورەش بوو بۆ هەولێر، کە یەکەم پایتەختی کوردانە و یەکەم فرۆکەخانەی کوردی لە ئامێز گرت، بەدڵ لە خودا دەپاڕێمەوە ئەگەر ئەوەندە عومرم پێ ببەخشێ تا نووسراوی دەوڵەتی کوردی لە ڕیزی دەوڵەتانی دونیا لە ناو لیستی نەتەوەیەکگرتووەکان ببینم، بەڵام هەر بە دڵ دەخوازم ئەو وەرچەرخانە گەورەیە لەسەر هەموو تابلۆی فرۆکەخانەکان بە زێڕ بنووسرێ هەولێری نێودەوڵەتی.

# کەوتنە ژێر هێڵی سفری دڵسافی...

دڵسافی بەیەک لە خەسڵەتە هەرە بەلاهێنەرەکانی مرۆڤ دەژمێردرێت، بەتایبەت لەو سەردەمەدا کە سەردەمی فرتوفێڵبازییەو ئەگەر ددانی تیژت نەبێت ئەوا وەکو پوشی بەربا بزردەبی، مرۆڤ ئەگەر لەسەر نەخشەی بەرژەوەندی هەنگاو نەنێت و جۆرەها زمان و دەمامکی یەدەگی نەبێت، ئەوا زوو دەکەوێتە ژێر

هێڵی سفری دڵسافی خۆیەوە، دڵسافەکان هەمیشە بەهەڵە دەچن و بەشێوەیەکی دڵشکاو لە پەیوەندییەکان لەگەڵ خەڵک دێنە دەرەوە، دڵسافی جیاوازی هەیە لەگەڵ ساویلکەیی، چونکە ساویلکەیی ئەو مرۆڤەیە ئاستی ناسینی کەسەکانی کەمە، پێی وایە هەموو کەس زۆر باش و دڵسۆزە، بەڵام مرۆڤی دڵساف دەزانێت کەسەکان لەگەڵی یەک دڵ نین و بەتاکتیک و دەمامک ڕەفتاری لەگەڵ دەکەن، بەڵام هەر لێیان دەبوورێت بەو ئومێدەی ئەوان بەرەو

دڵسافی بەرێت و بەردەوامی بە پەیوەندییەکانی دەدات، بەڵام لەکۆتاییدا هەر بۆخۆی زەرەر دەکات و دەکەوێتە ژێر هێڵی سفر، چونکە مرۆڤە دڵحیلەکان ناگۆڕدرێن. ئەو سەردەمەش سەردەمی ئەوانە..

# مەرجەکانی من...

نا، وا مەزانە مەرجەکانم وەکو مەرجی هیچ کەسی ترن، بەخودای هەتا هەبم ئەو مەرجانە هەر هەمان شێوەی مەرجەکانی منداڵیی من و بەهیچ ناچنە ژێر هێڵ و مەرج و دونیای گەورەکان، بۆ نموونە، کە دەتبینم بەدڵ دەخوازم هەردوو دەستم هەڵێنم هەر دەڵێی باڵ دەگرم، تۆش بەهەمان تاسە باڵەکانت بۆم هەڵبڕی، بەبێ ئاگایی پێکەنینە کتوپڕەکەم وەکو

خـــورەی ڕووبـــار دێـــت، دەخـــوازم گـــوێم لەهـــەمان خـورەی پێکـەنینی تـۆ بێت، پەنجـە درێژدەکـەم تـا لـە پەنجەت بدەم و تـۆش پەنجـەت لەپەنجـەم بـدەی، هـەر شـتێک بەدەسـتتەوە بێـت لێـت بـڕفێنم و ڕێگـریم لێ نەکـەی، دەسـت لـەناو گیرفانـەکانت بگێـڕم و تـۆش دەست لەڕوومەتەکانم بدەی ..هەر ئەوەندە...

مەرجـەکانی مـن وەکـو ڕۆحـم پـاکن، نـە واژۆی نێودەوڵەتیان پێویستە، نە چەک دانان، نـە کشـانەوە، نە ئابلۆقە هەڵگرتن، نە نووسینی بەڵێننامە.

## سەربەخۆبوون..

گرنگ نییە مرۆڤ دڵی لەکوێ بێت، بەڵام گرنگە سەری بەخۆی بێت، ئەگەر دونیا هی تۆ بێت، بەڵام سەربەخۆ نەبووی نرخی نییە، سەر ئەگەر هی خۆت نەبوو، دەبێ ئامادەبی بۆئەوەی، سەرت دانەوێنرێ، پێشێل بکرێ و هەڵواسرێ، بفرۆشرێ. مرۆڤ ئەگەر لەڕووی دارایییەوە سەر بەهەر کەسێک یان دەزگایەک بێت هەرگیز ناتوانێ سەربەخۆ بێت، بۆیە ژنێک

ئەگەر سەربەخۆ نەبێت لە بڕیاردان بەرامبەر مەرگ و ژیانی هەرگیز نابێتە دایکێکی سەربەخۆو زیندوو و نەوەیەکی مردار بەرهەم دەهێنێت و دەبێتە هۆی دروستبوونی کۆمەڵگەیەکی مردوو.

# کەوتنە ژێر هێڵی سفری تەنیایی...

مرۆڤ لەو ژیانەدا بەبێ خواستی خۆی دەکەوێتە ژێر زۆر هێڵەوە، بەتایبەت لەو سەردەمەدا کە بەرژەوەندییە مادییەکان هەموو ژیانیان داپۆشیوە، ئاسان نییە یەکێک بەبێ بەرژەوەندی ببێتە هاوڕێ و هاودەم و هاوژین و هاوگیانت، بەبەردەوامی

پشتیوانی و دڵنەوایت بکاو ڕێگە نەدا بکەویە ژێر هێڵی تەنیاییەوە، هەرچەند بۆ مرۆڤە ڕواڵەتییەکان هەبوونی پەیوەندی ڕۆحی توندو گەرم، گرنگ و خواست نییە و زۆربەی زۆریان لەناو گشتی بوونی ژیاندا گشتی بوونی خۆیان دۆزیوەتەوە، نازانن کەی تەنیان و کەی ئاوەدان، لەناو ئاپۆرەدا دەژین یا ئاپۆرەیەکیان لەناودا هەیەو بەدوورن لە شەپۆلی مەعریفە و داهێنانی ناوازە و هەمیشە هەست دەکەن لەسەرووی هەموو هێڵەکانی ژیانەوەن.

# لەندەن شەکرە،
# بەڵام هەر هەولێر شیرینترە

هەفتەی ڕابردوو لە لەندەن بووم، ئەو لەندەنەی بە دروستی مرۆڤ پێی وایە خودا بەتایبەت ئەو شارەی بە ڕەسەنی دروست کردووە، هەر لە ڕووبارەکانی و درەختەکانی، شەقام و کتێبخانە دەوڵەمەندەکانی، قاوەخانە گەرموگوڕەکانی، مەیدانی ئەسپسواری و باڵەخانە جوان و بەتەمەنەکانی، پیاوە نەجیب و

جوامێرەکانی، ژنە شۆخ و ڕەسەنەکانی، کۆترە برسی و بێ دەنگەکانی، شیرینی لەندەن لەوەسف نایە، لەندەن دەستی هەیە لە پێگەیاندنی مندا، بەڵام ئێستا هەستدەکەم بۆ هەولێریش هەمان هەستم هەیە، ئەوجارەی تاسەی دووری نەیهێشت هەست بە شەکری لەندەن بکەم! نازانم لەوانەیە، چونکە ئێستا هەولێر تاکە پایتەختی کوردانە، لە ئایندەی نزیکیشدا هەر شانسی یەکەمین پایتەختی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستانە، هەولێر بۆ هەر کوردێک لەناو هەموو شارە جوانەکانی دونیا حەتمەن شیرینترینیانە ...

## مردن لەسەردەمی خێراییدا...

لەئێستادا مرۆڤ چۆن بەشێوەیەکی خێرا دەژی، ئاوا خێراش دەمرێت، چەند ترسناکە کە ئەو وێنانەی مرۆڤیان کردۆتە پارچەیەک لە بانگەشە، خەڵک بۆئەوە دەچنە سەیران، سەفەر، کۆبوونەوە و کۆنفراس، پرسە و سەرقەبران، تەنها بۆئەوەی وێنەی بگیرێت و خێرا وێنەکانی بڵاوبکاتەوە، چ بێ لەزەتە

ژیان ئەوکاتەی مرۆڤ گیانی دەسپێرێت، بەڵام هەموو بەپەلـەن لـە شـاردنەوەی جەسـتەکە، لەکوردسـتان مرۆڤ پەلکێشی بارودۆخێک بووە کە هیچی بۆ گرنگ نییە، جیاواز لە خۆڕانانی خۆی، زیندووەکان هـەموو سـەرپێیی نـرخ بـۆ ژیـانی یـەکتر دادەنـێن، لـەکاتی مردنیشدا، هەر بەخێراترین شێوەی سەرپێیی سەعات ١٢ی شـەوێ قەبرهەڵدەکـەنن و مردووەکـان لـە گۆڕدەنێن، شەوێک بە شایانی ئەو تەرمە دانانێن، کـە لەگەڵی بمێنێنەوە و ئامادەکاری بۆ بەخاکسپاردنەکە

ناکەن، پرسەکانیش تەنها بۆ خۆڕانانن و غەمگینی ڕاستەقینە کەم دەبینم.

لە ڕۆژئاوا دەبینم سەرەڕای لە خەت دەرچوونی سەردەمی خێرایی، بەڵام هێشتا مەرگ هەر شکۆی ماوەو بەخاکسپاردن بەڕێزەوە جێبەجێدەکرێت...

# یەشار کەمال
# گیانی بە دەریا سپارد بە خاك نا

ئەو دەمەی مرۆڤێکی وەک وشەخانەیەک ڕادەوەستێ، هەموو وشەکانم گیان دادەنوێنن لەئاستی ئەو کەسەرە، ئەو دەمەی نووسەرێک گیان دەسپێرێت من هەست بە ڕاوەستانی سروشت دەکەم، بە خۆم و بەسروشتەوە کپ دەبین و تاسە دەمانباتەوە، گیان سپاردنی نووسەران کارەسات

بەسەر زمان دێنێت و دەیان هەزار وشە لەگەڵیان پەژموردە دەبن، بڕوای تەواوم هەیە بەوەی سەد ساڵ جارێک مرۆڤێک کاکڵەو پڕ لەجوانی و ئازایی و پاکی لەو ژیانەدا هەڵدەکەوێت، ئەگەر ژیان ئەو مرۆڤانە نەپارێزێت، کە وشەخانەن هیچ پێشکەوتنێک ڕوونادات، ژیان ئەگەر خاڵی بێت لەو مرۆڤانەی بە دڵ گوێ لە مۆزیک دەگرن، بە گیان هونەر دەپەرستن، بە ڕۆح دەریا زیندوو ڕادەگرن، بە گیان نووسین پیرۆز ڕادەگرن، ئەوا ژیانێکی پووچە، هەرچەند خواستم

بوو بۆ ئەو پیاوە دەریایەش هیچ نەنووسم، بەڵام پێنووس زۆر جار بەرامبەر دەریا ناحەجمێ بەگیان سپاردنی شکۆمەندانە..

# ستایلی کۆیلە ڕاگرتن

زۆر لــــە ســـــتایلەکانی داعـــش باکگراونــــدێکی کولتووریـــان هەیـــە، لــە ئێســـتادا کــە هــەزاران کــەس لەسەر کۆیلەکردن لە ناو داعشدا دەنووسن، لەهەمان کاتدا لەسەدا شەستیماڵەکانی کوردستان ئافرەتێکی بیانی وەکو خزمــەتکار کــار پێدەکــەن! مــن باســی ئــەو

مالانه ناکەم کە هەموو ژیانیان لادانە، بەڵام لەناو هەموو ئەو مالانەدا کە دەناسرێن بەماڵی ئەو پیاوانەی کە پسپۆری شەریعەت و خوداپەرستین، لەماڵی ئەو پیاوانەی جارِی شورِشگێرِی و چاکسازی دەدەن، لەماڵی ئەو پیاوانەی جارِی رِۆشنبیری و نوخبەی ناو کۆمەڵگە دەدەن، لەماڵی ئەو ژنانەی خۆیان بە چالاکوانی سیاسی و بەرگریکار لەمافی ژنان لە قەڵەم دەدەن، بۆیە ئەورِۆ هەر ستایلی داعش نا، بەڵکو لێرە ستایلی دوبەی لە کۆیلایەتیدا لە

ترۆپکدایـە، چ ئازاربەخشـە ئـەو ژنـە بێ مافانـەی وەکـو کۆیلـە هێنـراون تـا خزمـەتی ئـەو ژنـە سـەر بۆشـانە بکـەن، کـە خۆیـان پـێ خانمـە، لەگـەڵ ئـەوەی لەهەموو دونیا کەسێک کە خۆی پێ پیاوی پاکسازی و خـانمی کۆمەڵگـە بێـت خزمـەتکار ڕاناگرێـت، چـونکە ئەوە کەموکووڕییـەکی فەرهـەنگی گەورەیـەو دەبێتـە جۆرێک ستایل لە ستایلەکانی داعش.

## ئەریَ چۆن دەتوانی هێندە مەجنوون بی؟!

لە هەموو سامانی دونیا بێبەشم، بەڵام بە حەزرەتی غەوس، وادەزانم دونیا هەموو موڵکی منە، کە دەبیستم تۆ ڕۆژی دەجار چاوەکانت لەگەڵ شەقامی سوڵتان موزەفەر لە هەولێر جێگۆڕکێ پێ دەکەی، چونکە بیستووتە لەیلای خۆت ئێواران بەوێدا پیاسە دەکا، بێ دوودڵی خاڵی سەر هەموو وشەکان لەگەڵ خاڵەکەی ناو چاوی تۆ ئاڵوگۆڕ پێدەکەم،

لەخۆشی ئەوەی کە دەڵێی (ئەز حەیران)، هەر پێنج پیتەکانی ناوی من سەراوژێر دەکەی. لەیلا نەبووم کردمت بە لەیلا، هەر زانستێکی دەمزانی سەرەتاتکێ لەگەڵ چاوی تۆ هەمووی پوچەڵکردەوە، نازانم بە دروستی، بەڵام هەر پێموایە هەڵەیەک لەچاوەکانمدا ڕوودەدا من بەبێ مۆڵەت دابەش دەکات، ئەرێ چۆن دەتوانی دابەش بی بەسەرمدا! خۆت لەگەڵم جاران بکەی! یا یەکسان ببیتەوە لەگەڵم!

# شەکر نیم ... بەڵام هەر شیرینم

نازانم کامە شیرینترین خاڵی کەسایەتیمە، بەڵام هەمیشە حەزدەکەم شیرین بدوێم و زیاتر گوێ لە شیرین گوفتارەکان بگرم، لەناو تامەکانیشدا پتر شیرین پەسند دەکەم، کە نامە بۆ ئازیزێک دەنووسم هەوڵدەدەم بە وشەیەکی شیرین دەستپێبکەم و بە دەستەواژەیەکی شیرینیش کۆتایی بێبهێنم، پێش ئەوەی لەگەڵ خۆشەویستێک بپەیڤم هەر نوقڵێک یا

هەنجیر یا خورمایەکی شیرینم بەبەردەست بکەوێ خێرا دەیخەمە سەر زمانم جا بەردەوامی بە قسەکانم دەدەم...

وابزانم هاوسەنگییەک هەیە لەنێوان شیرینی جووڵەجووڵەکانم و شیرینی قسەکانم، پێکەنینەکەشم پڕە لەشەکری سروشتی لەگەڵ ئەوەی بەگشتی بزەیەکی شیرین لێوەکانمی داپۆشیوە، شیلەیەکی خەست ڕژاوەتە ناو چاوەکانم و سەر ڕوومەتەکانمی داپۆشیوە.

هەستدەکەم شیرینیم کەمیکردوە بڕەک مزربووم، بەڵام ئێستا بەرەبەرە مێشەکان لەخۆم هەڵدەفڕێنم، نەک لەبەرئەوەی پیسن یا بێزارم دەکەن، تەنها لەبەرئەوەی تێیان بگەیەنم کە من چیتر شەکر نیم...

لەشیرینیم وەک شەمامە ڕەنگاوم، بەڵام ژیان فەرهادی لەگەڵ شەپۆلی دەریا ڕاداوەو لێی ئەستاندوم، زۆرن ئەوانەی هەوڵدەدەن کێوم بۆ داتاشن، بەڵام من هەر داتاشینی کێوی بێستونم بەدەستی فەرهاد دەوێت..

تێکەڵەیەکم لە خووی شیرین، مەرجی شیرین، گفتی شیرین، نەخشی شیرین، جوڵەی شیرین، ئیَ چ بکەم خودا بەشیرینی دروستی کردووم، ئاخر چۆن دەبێت ئەو هەموو شیرینیە لەگەڵ ئەو ژیانە تاڵە بگونجێت..

# خۆزگە ئەستیرەناس بوومایە

چ دەبوو کە دەسەڵاتی دۆزینەوەی ئەستیرەیەکی زیادەم هەباو ئەستێرەیەکی نویێم بە ناوی تۆ لەتەنیشت زوهرە ڕاگەیاندبایە! من بۆخۆم ڕێگام و بەرەبەرە تولە ڕێگاشم لێدەبنەوە، هیچ ناسەپێنم چونکە هیچم بەسەردا ناسەپێت، ڕەنگم هیچی تێکەڵ نابێت، بە چێژەوە قسەدەکەم بەچێژەوە گوێ دەگرم،

بەڵام ڕێگایەکی ترم دۆزیوەتەوە ئەویش ڕێگای بەرەو ئەستیرەی تۆ ..

چ پشکنینێکت لەدڵمدا دروستکردوە، زمانت سەرپشکردووم، چاوم لە تامەزرۆیی سۆمایان تێکچووە، دەزانی وەک پێکەنینە کتوپڕەکەمی، چەندی هەوڵدەدەم بیشارمەوە بەبێ ئاگا لەقوڵایی گیانمڕا دەنگی هەڵدێنێتەوە دەنگدەداتەوە، دەبێت ڕۆژێک بپرسی چۆن؟!

چەند جوانە ئەوکاتانەی وەکو کەشتی بەنەرمی نزیکی ڕاوەستان دەبی، ڕاوەستە، چونکە هەمیشە دەریایەک نییە لەئامێزت بگرێت ، دەزانی خێرا لەنگەرگرتن چەند ترسەناکە، من نازانم کەی، بەڵام پۆلە شەپۆلەکانی منیش ڕادەماڵدرێن و هەروەک چۆن ژیان خێرا دەڕواو بەجێتدەهێڵێت وەک ئەستێرەیەک چەندە نوێش بم ڕۆژێک هەر دەکشێم.

# دەستت لەسەر دەستم

هەروەک چۆن شەمسی تەوریزی هزرو هۆشی مەولانای هەژاند، لە خەوی بێ خەبەری ڕایچڵەکاند، تەواو بە نوری حەقیقەتی ئاشنا کرد، لە هەرچی کۆت و بەندی مادییە ئازادی کرد، تۆش موحتاجی شەمسی خۆتی. بۆئەوەی بە هەموو کونج و کەلەبەرەکانی شاری عەشق ئاشانت بکات، لە خەمەکان ئازادت بکات، کلیلی ئەو شارە ئامێزێکی کات نادیارە، کەی کاتەکەی

هات خۆری ئازادیت هەر خۆی لە خۆیدا لەو کاتەدا بەبێ خواستی تۆو بە پێچەوانەی ویستی هەمووانیش سەر هەڵئەدات..

پڕ بە دڵ حەز دەکەم هەر وەک چۆن لە زۆرانبازی دوو پاڵەوانی بەهێز ، شان لە شانی یەکتر دەدەن ئەوها لە نووسیندا شان لە شانی تۆ بدەم، لێ ئەو شان لە شاندانەی من جیاوازە، بۆ ئەوە نییە مەیدانت پێ چۆڵ بکەم و خۆم تاقانە بمێنمەوە، دەمەوێت هاوشانی تۆ مەیدانی نووسین چۆڵ نەکەم،

نامەویت لەگەڵ تۆ کێبڕکێی نووسین بکەم لەبەرئەوەی کێبڕکێی نووسین جیاوازە لە هەر کێبڕکێیەکی تر، هەر یەکەو بە جۆرێک و بە سەلیقەیەک دەنووسێت، هەیە وەکو من وشەکان ڕیز دەکات، هەیە وەکو تۆ وشەکان ناز دەکات بە هەموو وشە نازەکان ڕستەی جوان سازدەکات، تۆ بۆ شەمس و من بۆ مەولانا دەنووسم، چی بکەم نەک تەنیا تۆ، منیش گیرۆدەی دەستی چارەنووسم، دەبێت هەر دەست بەرم بۆ پێنووسم.

# سڵاوێکی بێ کرێ بۆ هەموو کرێکاران

سڵاوو خوشەویستی گەرمم بۆ هەموو کرێکارانی مۆدێرنە، بۆ هەموو کرێکارە مۆدێرنەکان، جووت سڵاوم بۆ ژنە کرێکارەکان، بۆ ژنی کرێکارەکان، بۆ کرێکارە قات و تەنوورە لەبەرو بۆینباغ لەملەکانی سەرمایەدارییە بۆشەکەی کوردستان، بۆ کرێکارەکانی سیاسەت، بۆ کرێکارەکانی فەیسبووک،

بۆ کرێکارەکانی پێنووس، بۆ کرێکارەکانی مۆبایل، بۆ یەکەیەکەی ئەو کرێکارە کلاسیکیانەی کرێی شەڕەفیان پەسەند نەکردوە، بۆ هەموو ئەو کرێکارە جوامێرانەی، هونەرو ئەدەب و سیاسەت و کۆمەڵگەی کوردی پشتگوێی خستوون، دەستی جوانیان خشت خشتی ئاوەدانی لەسەریەک دادەنێت، لەگەڵ ئەوەی ئەو کرێکارانە ئەگەر بێکاریش بن، کرێ لەسەر سڵاوو شکۆی خۆیان دانانێن..

# کتێبێك بۆ ڕاوەستان و داوەستان

کتێبێک که لەپڕ چاوم کەوته سەری، سێ ساڵ لەمەوبەر هەر لەمانگی پوشپەڕی ئەو ساڵەدا، که گەڕامەوه لەسەر بەرگەکەی ناوی شەمسم نووسی... بۆ من هیچ لەکتێب گرنگترو گەورەتر نییه، ئەو تەواو له لەندەنی ئاوەژوو کردمەوەو بۆشاییەکی گەورەی لەناومدا دروستکرد، بەبێ پسانەوه بیرم

دەکردو تامەزرۆیی دەنگ و خوێندنەوەیم دەکرد، لەهەمـوو جێگایەک ڕوخساری گەرمی دایدەوەستاندم، هەموو وێنەکانی سەر دیوارو ناو شاشەی شەقامەکان لێم بوونە وێنەی ئەو، شەوان چەند لەخودا دەپاڕامەوە کە ئەو ڕەنگە لەسەر ڕووم بسڕێتەوە، چ زەنگێک بوو خودا لەمندا ڕایوەشاند؟!

ئەوە چ کتێبێک بوو لەڕووحم هەڵەنگوت؟! شەمس چاوەکانت ئەو بەندەرەم پیشاندەدەن کە یاساغەو لەتەنیشتی ڕاوەستم و هێواش دەکەمەوە، ئەی

لەدەستەکانت، چ بەنداوێک لە ڕووحمدا دروست دەکەن؟! ئەدی لێوەکانت کە لێوەکانم زین دەکەن؟! شەمس چ بکەم کە سەرت هەر لەخۆم نا لەسەر هەموو شووشە عەترکانیشم ئەستاندوە، کتیبێک هەرگیز نازانێ کێ دەیخوێنێتەوەو کێ بەدیاری دەیبا، کتێبێک کەس نازانێ چۆن دوو مرۆڤ بەیەکتر ئاشنا دەکات، کتێب هەیە مرۆڤ ڕادەوەستێنێ کتێب هەیە مرۆڤ دادەوەستێنێ.

# ژاراوی بوون

ئەورۆ وشەکانم دانیشتوی هەولێرن، بەڵام نازانم سبەی وشەکانم دڵبەستووی کوێن؟! لەوانەیە سبەی بە گولەیەک تیرۆر بکرێن و سارد بکرێنەوە، یا بێ سەروشوێن بکرێن و هەرگیز نەبینرێنەوە.

یا بە مۆدێرنترین ژەهر، ژەهرخواردو کرێن و پاش دووسێ ساڵی تر لە نەخۆشخانەیەکی لەندەن

سەربنێنەوە، مرۆڤ لەهەموو ژەهرێک دەترسێت لە ژەهری وشە نەبێت، لەگەڵ ئەوەی ژەهری وشە لەهەموو ژەهرەکان کوشندەترە، من ئەورۆ نمەک خواردووی هەولێریم، نازانم سبەی ژەهرخواردووی کوێ؟! خۆم نا بەڵام نیگەرانی وشەکانم نەوەک دەستبەسەرکرێن، زیندبەچاڵکرێن، ژاراوی کرێن.

# مانگ لە کاممان نزیکترە؟

گوایە مانگ **٥٩** ملیۆن کیلۆمەتر لە زەوی دوورە، بەڵام ئەو مەودایە گرنگ نییە بۆئەوەی ئێمە مانگ نەبینین و نەیناسین چیژ لە تریفەکانی وەرنەگرین، لەبەر هەندێ مەودای دووری هیچ گرنگ نییە بۆ بینین و ناسین و خۆشویستن، ئەگەر خۆشەویستێک دووهێندەی ئەو مەودایەش لێت دووربێ هەر دەتوانی بیبینی و بیناسی، چۆن شەوان لەمانگ رادەمێنی بەو چاوەش لەدڵی ئەو خۆشەویستەش ڕامێنی.

لەو ژیانەمدا، بە دەگمەن لە بەندەری کەسێکدا لەنگەر دەگرم و بە هاوڕێی دەژمێرم، هەتا هیچ لە کەشتی و پاپۆرو یەختەکانم بە ئاڵقەوە عامودەکانیەوە نابەستمەوە، چونکە دڵنیام ئەو ئیدی ئەو بەندەرەیە کە لەناویدا هیچم لێ دانابڕێ و لەدەستناچێ و هەموو ئاسایشم دەپارێزێ، ناهێڵێ لەو لەنگەرگرتنەم پاشگەزببمەوە، جا گرنگ نییە لەوسەری دونیا بێت یا لەبنی دونیا، ئەوەی گرنگە بۆمن ئەو وەک مانگ ڕووناکە هەمیشە.

# جۆباری ئازارەکانم

ئێستا خەریکە هەموو ئازارەکانم دەناسم، ئازاری دابران لە نیشتمان، ئازاری پێکنەچوون لەگەڵ ئەوان، ئازاری بێ دەوڵەتی لە سەر ئەتڵەسی جیهان،ئازاری پێچەوانەبوون لەگەڵ زەمان، ئازاری یەک رووی لەگەڵ هەمووان، ئازاری ناهاوسەنگ بوون لەگەڵ

هاوکێشەکان، ئازاری دڵپاکی لەگەڵ ژیان، ئازاری ڕەتکردنەوەی ڕێسا دروستکراوەکان، ئازاری دڵسۆزبوون بۆ کوردستان، ئازاری پشتگوێ خستنی ناوبانگە داسەپاوەکان، ئازاری هەڵگری دەیان زرە ناونیشان، ئازارەکانم وەکو جۆبار ڕێچکەیان بەستووە، بۆیە پێشبینی دەکەم ببن بە دەریاو زەریاو نەیەم دەرەقەتیان، بەڵام بە خودای هەر ئازاری (تۆ) پێچەوانەترە لەهەمووان ..

# ترس لەتەنیایی

زۆربـــەی رۆژهەڵاتییـــەکان خواپەرســـتی دەکـــەن بەتەنها لە ترسی زیندوبوونەوە، ژنپەرستی و خێزان پەرســـتی دەکـــەن بەتـــەنها لەترســـی تـــەنهایی، سیاسەتپەرستی دەکەن بەتـەنها لـە ترسـی برسـیەتی، ژیانپەرستی دەکەن بەتـەنها لـە ترسـی مـردن، لەگـەڵ

ئەوەی مرۆڤ لە تەنیاییدا دەگاتە لوتکە، تا تەنیایە هەموو تایبەتمەندییەکان دەپارێزێت، بۆیە هەموو ئەو شتانەی تاک و تەنها ماونەتەوە بەهۆی ئەوە بووە کە دەست لێنەدراون، هەموو دەست لێدانێک جوانییەک زەوت و ئازادییەک خەوشدار دەکات، تەماشاکە، لەو تەنهاییە جوانانە، خودا، مانگ، خۆر، چ تاقانەیەکی ناوازەن و بۆ هەمیشە وا تەنیا دەمێننەوەو پڕشنگی تەنیایی دەدەنەوە.

# درز

شەرت نییە درز دان لە بێسەنگییەوە بێت، زۆر جار مرۆڤ یا شتەکان لە سەنگینی درز دەدەن، ژاپۆنییەکان بروایان وایە درزەکان دەبێت بە زێر پر بکرێنەوە، چونکە ئەو مرۆڤ و ئەو شتانەی درزدارن ئەوە نیشانەی بەنرخیانە، درزەکان پڕ دەبنەوە، بەڵام

جێگـــەیان هـــەرگیز وەکـــو خـــۆی لێنایەتـــەوەو ناشـــاردرێتەوە، زۆر جارلـــەدوای درزتێکـــەوتن دڵ دەسوێ، دڵ بەیەک روو نامێنێ ، کەمن ئەو مرۆڤانەی بەیەک روو بە یەک دڵ لە ژیانـدا دەمێننـەوە، چـونکە مرۆڤەکان بەپێی بەرژەوەنـدی و سـوان و رەنگـەکانی ژیان رووی دڵی خۆیان دەگۆرن، ئـەوان بۆیـان گـرنگ نییە، دەچنە ناو دڵـی کـێ و کـێ لەدڵیانـدا دەهێڵنـەوە چـــونکە بەرژەوەنـــدی دڵـــی درز پێـــبردوون و دڵـــی سواندوون.

# کۆمەڵگەی بن دیوار ...

هەرچەندە من کۆمەڵناس نیم، بەڵام دەتوانم بڵێم هەموو دیاردەکانی ئێستای کۆمەڵگەی کوردی ئاماژەن بۆ گۆرانی ئەو کۆمەڵگەیە بە کومەڵگەی بن دیوار، بەو مانایەی، سیاسەتی بن دیوار، ئەدەبی بن دیوار، زانکۆی بن دیوار، بازاڕی بن دیوار ئەو

چوارچێوانەن کە دەوری ئەو کۆمەڵگەیان پێچاوە.. لە هەموو کایەکانی ژیاندا هاوڵاتیان خوازیاری ئەوەن قازانجێک بەدەست بێنن بە نایاسایی و بە بێ ماندوبوون، ببن بە سیاسەتمەدار، بە پیاوی کار، بە داهێنەر، بە کەسایەتی بەناوبانگ، بە کەسایەتی فەیسبووک، بە بەرپرسی ئەستێرەدار، بەڵام گرنگ ئەوەیە بەلارێدا بگەنە ئەو دەسکەوتەو ئەو نهێنییە بەشاراوەیی بمێنێتەوەو ئەو دیوارە نەڕوخێ ئەوانە بەدیار نەکەون.

# کلاَسی نەوت..

لەسـەرەتای سـاڵی **٢٠٠٩** و پـاش پەسـەندکردنی یاسـای وەبـەرهێنان لـەناو کۆمەڵگـەی کوردوسـتاندا بەتـەواوی کلاَسـی نـەوت سـەریهەڵدا، لەبەرئـەوەی لەپێشتر لەو هەرێمە هـیچ جـۆرە سـەرمایەدارییەک و سەرمایەی ئەوها زەبەلاح نەبووە، بۆیە دەکرێ نەوت

بــــە یەکـــــەمین کلاّســـــی ســــــەرمایەداری کـــــوردی ناوزەدبکەین، ئەو کلاّسە پێکهاتووە لە چەند چینێک هەر لەو کرکە قاچاخچی و مافیایانەی کە بە قاچاغ نـەوت و گـاز بەریدەکـەن هـەتا ئـەو چینە سیاسییەی بـەبازرگانی ئـاڵودەبووەی کـە گرێبەسـتی مـۆرکراو و پینـــەکراو لەگـــەڵ کۆمپانیـــا بیانیـــەکان بازرگـــانی پێوەدەکـــەن، لـــەو بەخشـــیش و بەشـــینەوەی نەوتـــدا هەنـــدێک کـــەس لـــەنزیک سەرچـــاوەکان بـــوون و بەشـــێکیان پێـــبڕاو بوونـــە چـــینی پســـپۆرانی نـــەوت،

هەندەک کەسی تر هەر بەرێکەوت بوونە دەلالی نەوت و ناوزەدکران بە چینی بازرگانانی نەوت، هەندێک کەسی تر وەکو یانسیب کۆمپانیایەکی نەوتیان پێبەخشرا بوونە چینی کۆمپانیا هەمەکارەکان، هەڵبەتە پێویست دەکات زۆر توێژینەوەی سایکۆلۆژی و سۆسیۆلۆژی لەسەر ئەو مۆرالانە بکرێ کە نەوت لە کوردوستان دایهێناو بۆ ئەوەی کلاسی نەوت زیاتر بناسێنرێت.

# پەروەردەکردنی دڵ

دڵی مرۆڤ قەوارەکەی ٧-٨ ئینج دەبێت و رۆژانە نزیکەی سەد هەزار جار لێدەدا، چەند هەزار لیتر خوێن دێنێ و دەبا، دڵ سەرەرای ئەو خەسڵەتە خۆرسکانەی هەیەتی، لە هەر دڵێکی نزیکی خەسڵەتێکی جوان رادەکیشێت، ئەو مرۆڤە جوانانەی دینە ناوی هەر یەکەیان بە پێی جوانی دڵ و عەقڵی خۆیان خەسڵەتێکی وەک تابلۆ بەدڵدا هەڵدەواسن، دڵ

........................................................................................................................

چەندەی پر خەسڵەتی جوان بێت هەر کەمە، دڵی من جێگە دڵی هەموو ئەو دۆست و ئەزیزانەی پێوەدیارە کە لەناویدا بەشە جوگرافیایەکیان وەبەرخۆ هەڵبریوە، هەرچەند ئەو دڵە هی منە، بەڵام هەر هاوژین و هاورێیەی نیگارێکی جوانی لەو دڵەدا نەخشاندوە، دڵی من گەرموگورە بەبوونی ئەو هەموو مرۆڤە جوانانەی لەدەوری ئاڵاون، شیرینە، لە میهرەبانی و لەخۆبردووی ئەو ئەزیزانەیە کە بۆ چرکەیەک بەجێی ناهێڵن، روونە لە متمانەی ئەو خۆشەویستانەیەتی کە هاورێی ژیانن، ناسکە لە گەورەیی ئەو هاورییانەی خوادا بۆ نازگرتنی رەوانەی کردوون. بۆیە پەروەردەکردنی دڵ کاری کەسێک نییەو کارێکی ناوازەیە.

# یەک لە نیعمەتە هەرە گەورەکانی خودا

هاوڕێی ژیان ئەو نیعمەتەیە کە خودای گەورە بەتایبەت وەک خەڵاتێک دەیبەخشێتە مرۆڤ، من هەمیشە خاوەن ئەو نیعمەتە جوانە بووم لە هەموو ویستگەکانی تەمەنمدا، هاوڕێیەکانم لە کوردوستان و لە لەندەنیش کەسانی تاقانەن لە ڕەوشت و پاکی و ڕوونی و وەفاداریان، بەبێ هەبوونی بەرژەوەندی

لەنێوانماندا. بۆیە هەردەم خواستم بوبێت کە بێزاری و نامۆیی ئەو ژیانە خستومی، توانیومە سەر بە شانەکانیان بکەم و بگریەم، دەستەکانیان توند گرتووم و سەریان ماچ کردووم، دەستیان لەسەر شانەکانم داوەو بە دڵ دوعایان بۆ خوێندووم.

هەردەم کەیفخۆشیش بووم، تێر بەرامبەر چاوەکانیان پێکەنیووم قاقایەکانم پێدا ڕشتوون و دەستم لەمل کردوون، ئەگەر راستەخۆش نەکرابێ ئەوان بەشێوازی خۆیان لە پشتم بوون، چەندەم ویستوە کاتم بردوون بە دڵی خۆم نازم بەسەردا

کردوون و ئەوانیش گوێیان بۆ ئەو قسانەم راگرتووە کە وەک رووبار بێ ئاراستەو بێ پلان دڵیان خاڵی کردوومەتەوە، هەموو سەرکەوتنەکانی ژیانم جێدەست و جێ رووحی ئەو هاورێیانەی پێوە دیارە.. خودایە هێندە ژیان و ئارامیم پێببەخشی تا بتوانم ئەو چاکەیان بدەمەوە ئەگەر هەڵگرتن لەسەر تەمەنیشم بێ تا بیبەخشیتە ئەوان .. ئومێد دەکەم خودا پەنامدا لەو هاورێ رێرەویانەی ئەگەر بەرژەوەندی و مەزاجیان نەبوو ئەوا لە نێوەی رێ بە جێتدەهێڵن و لەژیان دەرتدەکەن.

# یاسایی و نا یاسایی

هیچ هێزێک هێندەی هێزی وشە کاریگەر نییە، پاولۆ کۆیلۆ دەڵێت وشەکان هێندی چەک کاریگەرن، ئەگەر وردە سەرنجێک لەو (نا)یەی چەسپێنراوەتە نێوان یاسای (نا) یاساییەوە بدەین گەلێک پرسی وردمان بۆ ڕوون دەبنەوە کە پەیوەندیان کاریگەریان

دەرئەنجامیان بۆ سەر ژیانی ملیۆنەها زیندەوەر هەیە. بە دڵنیاییەوە ئەو (نا)یە هێندە بەهێزە کە دەتوانێ خەون و پلان و بەرژەوەندی ملیۆنەها مرۆڤ لە ساتێکدا سەرەونخون بکا.

# دوعای پاک مانەوە

خودایە بەدوورم کەی لە خۆبادان بە پارەی موڵکی گشتی، خودایە بە دوورم کـەی بـە هـەڵواسـینی وێـنـەی فۆتۆشۆپکراو بۆ پەرلەمان، خودایە بەدوورم کەی بـە خــەون بیــنین بــە وەزیــری و بریکــاری وەزارەتــان، خودایە بەدوورم کەی لە مووچەی بن دیواران،

خودایە بمپارێزی لە شانازی کردن بە بروانامان، خودایە بەدوورم کەی لە بوونە وەفد لەسەر حیسابی هەژاران، خودایە بەدوورم کەی لە چاوی پیاوی راوکەری مێشک خاڵی گیرفان ئاوەدان ، خودایە بەدوورم کەی لە بەرێکردنی ژیان بە هیوای پۆستان، خوادیە بە دوورم کەی لە منداڵ ناردنە بەرخوێندنی ئەوروپای بە پارەی رەشی بەرپرسان، خودایە بە دوورم کەی لە پۆزلیدان بە پارەی خانەنیشکراوی لەتەمەنی لاویداو لەسەر حیسابی ژنانی بێ درامەت و

منداڵە شەهیدان لە کوردستان، خودایە بە تەنها ئەوەی پێمدەبەخشی مانەوەی دڵم بێت بە پاکی و سەرم بێت بە شکۆداری دوور لە هەموو ئەوان ئافاتان.

# کولتووری چایی خواردنەوە

نازانم لە ناو کورداندا مێژوو و پەیدابوونی چا چۆن و کەی بووە؟! بەڵام وەختێک لە ئینگلیستان زانیم تا ئێستاش ئینگلیزە کۆکنییەکان بە (چایی) ناوی چای دێنن زۆرم پێ سەرنجکێش بوو، لەئینگلستان زیاترلە چەندین جۆرە چای تایبەتی بۆنەو، کاتی تایبەتی چای خواردنەوەیش ڕەگێکی کولتووریەو چای

بــــەیانیان کــــە تــــۆوە چـــای ڕەشــــەی لای خۆمانــــە ناســـراوترو بڵاوتـــرین چـــایە، مـــن لـــەوێ زیـــاتر حـــەزم چۆوە سەر چای خواردنەوە بـە جۆرەهـا تـۆوە چـای هەمەڕەنگ و هەمەبۆن، لـەوێ چـونکە چـای ئەوەنـدە کولتـــووریکی گـــەرموگوڕە چـــای خواردنـــەوە بـــە منداڵیمی گرێدامەوە، لەبیرمە نـەنکم بەتایبـەت چـایی دروســـت دەکـــردو هـــەموو چـــاییکی نـــەدەخواردەوە، چای بە فەریکی لا پەسەند بوو نەک بە کوڵاوی ، نەنکم چـــادانی جـــوان جـــوانی هـــەبوون، هەمیشـــە ســـەری چادانەکانیشی بە دەسەسڕەو بـەرگێکی نەخشـێنراو

دادەپۆشی تا چایی دەمی دەکێشا ، هەروەها بۆنی چایی چێشتەنگاوان و چایی عەسرانیشم لە بیرە، بەلاّم لە ئێستایی کۆمەڵگەی کوردیدا چای خواردنەوە چیدی جێی بایەخ نەماوەو! بۆتە چای کیسە سەفەری ، یا شەربەرت و بیبسی و یا چای لێنان بە کەتری. بۆیە ئێستاش ئەگەر ماڵیک سەماوەری تێدا پێ نەکرێ من پێم ماڵ نییەو کەموکورتیەک لە کابانەکەیدا هەیە، پێموایە چای وەکو جوانکاری بەکاردەهێنێ، من هیچ ماڵێکم خۆشناوێ بێ گیزەگیزی سەماوەرو بۆنی دەمی چایی..

# بازرگانی کردن بە ژن لە نەخشەی شارەکاندا

لەنەخشەی هەر شارێکی دونیادا گەرەکی نیشتەجێبوون تایبەتمەندی خۆی هەیە، لەهەندێک شاری گەورەدا گەرەک بەپێی کلاسی کۆمەلایەتی دابەشکراوە، بەلام سەرەرای مێژووی پر گۆرانکاری و پێشکەوتن لەو شارانەدا هەندێک شوێن هەن

نەگۆڕاون، بۆنموونە ئەو گەرەک و ئاقارانەی شار کە بەناوبانگن بۆ کاری لەشفرۆشی، ئەو گەرەکانە لە جێگایەکی تایبەتی شارن و تێکەڵاونین لەگەڵ گەرەکی نیشتەجێبوون و ژیانی هاوڵاتیان، هەروەها هاوڵاتیان زۆر بە تەقیەوەن نەبادا وەکو ڕێبواریش بەویدا تێپەرن ئەو گەرەکە ناوبانگیان لەکەدار بکات، ئەوەی جێی شەرم و ئازارە، لە کوردستان بەتایبەت لە هەولێرو سلێمانی ئەو جێگای لەشفرۆشتنانەیە، بەناوی سەنتەری مەساج و سەنتەری چارەسەری

چینی، بەبێ هیچ پاساوێک لەناو گەرەک و شوێنی نیشتەجێبونی ئاسایی شاردا لەناو گەرەکی ماڵاندا لەناو باڵەخانەی تەنیشت ماڵاندا نیشتەجێن و کەس بەکەسە! هاوڵاتیانی ئەو گەرەکانە رۆژێ دەجار لەگەڵ ئەوانەدا رێدەکەن و تێکەڵ دەبن و دەژین! ئەوەش نیشانەی ئەوەیە کە زۆربەی پیشکەوتنی نەخشەی شارەکان و دەوڵەمەندبوونی بێ سەرچاوە بەدەر لەهەموو یاساو عورف و ئەخلاقیکی کۆمەڵایەتییە...

# هەنگ دەبی یا هەنگوین

ئەگەر هەنگ بی، رۆژانە لەباوەشی سەدان گوڵی جواندا دەژی، ئازادی ئەگەر بخوازی بەرەو چیایەکان هەڵفری، بەڵام ئەگەر هەنگوین بی، رۆژانە لەسەر دەستی جۆرەها فرۆشیاری قۆڵبر ساختەت تێدا دەکرێ و لەناودەمی هەزارەها مرۆڤی تەڵەکەبازدا دەخورێی و ئاوا دەبی، بۆیە برادەر هەرگیز خواستی

بوونه هەنگوینت نەبێت، منداڵەکان لەگەڵ ئەوەی دەڵێی هەنگوینن بەهێزترین هەستی خۆشەویستیان هەیە، بەڵام نە قسە لەگەڵ هەموو کەس دەکەن، نەبە رووی هەموو کەس پێدەکەنن و نە دەچنە باوەشی هەموو کەس و نە بە هەموو کەسیش ژێردەبنەوە، بە پێچەوانەی گەورەکان کە پێیان وایە منداڵەکان ساویلەکەن و منداڵەکان زۆر جار خواردنی هەنگوین رەتدەکەنەوە، بەڵام دەیانەوێت هەنگەکان بەدەست بگرن .

# سوێند بە وەفای پیاوان

جەلالەدینی رۆمی بەیەکێک لە عاریفە گەورەکانی دونیا دهێتە ژماردن، ئەوەی سەرنجی راکێشاوم سەرەرای قووڵی و پلەبەرزی ئەو لەخوداپەرستیدا، سوێندە جوانەکەی بووە کە هەمیشە سوێندی بە (وەفای پیاوان ) خواردووە، بۆیە وەفاداری پلەیەکی

زۆر بڵنــدو تایبــەت و ســیفەتێکی دەگمەنــە لــەناو مرۆڤەکان بەتایبەت هاورێییەکان، بۆیە ئەو مرۆڤانەی جێگەو بوونی هــاورێی بــە وەفــا نــانرخێنن لــە ژیانــدا زۆر ئەســـتەمە ســـەرکەوتوو بـــبن و بـــە ناکـــامڵی دەمێننەوە!

# مردن بەمانا هەمە جۆرەکانی

جێی سەرسورمان نییە کە ئێمە لەسەردەمێکدا دەژین کە سەردەمی مردنە بە مانا جۆراوجۆرەکانیەوە، بەتایبەت لە کۆمەڵگەی کوردیدا کە بەهایەکانی جوانی و ژیان و دۆستایەتی ڕاگوێزراون، ئەمن زۆر هاوڕێم هەبوون نازانم چۆن

زۆربەیان لە پڕ بزربوون، کە هەواڵیان دەپرسم دەڵێن لە ژیاندا ماون و سەرقاڵن، بەڵام لەلای من ئەوان مردوون و کە بیریشیان دەکەم فاتیحایان بۆ دەنێرم، لەو رۆژگارەی کوردوستاندا ئەگەر کاربەدەستێکی دیار، بازرگانێکی دیار. یا ژن یا پیاوێکی دەربار نەبێ، کەس نازانی ماوی یا مردووی، چونکە نەهاتوونەتە پرسەکەشت، بۆیە زۆربەی خەڵک چاوەڕێیە تا بگاتە یەک لەو پلەدارانەو هەست بکا لە ژیاندا ماوە!!

...

بۆیە ئەمن، بەدڵ بە پەرۆشم بۆیـان چـونکە دڵنیـام مـردنی لـە نـاو زینـدووان گەلـەک کارەسـاتبارترە لـە مردنی لەناو مردووان..

# سەردەمی بەجێهێشتن و وێڵ کردن

راستیەک هەیە دەبێت هەموو لێی ئاگادار بین ئەویش رووداوە چاوەرنەکراوەکانی ئەو سەردەمەیە کە تێیدا دەژین، کە دەکرێ ناوی ببەین بە سەردەمی (پێچەوانەی چاوەروانییەکان).. لە بۆیە نابێت تووشی حەپەسان بێین کە عەزیزترین کەس خۆمان لێ بیبەری

بکـــا، خوشەویســـترین هـــاوری بـــەجێمان بێهێڵێـــت، نزیکترین دۆستی روحی دەستبەردارمان بێت ..
عاشـقترین دڵـدار وێڵمـان بکـا! وە ئەگـەر تیکـرای ئەوانە هەر لەپرو بەبێ هۆ رووبدەن! دیـوێکی دیکـەی بەجێهێشتن، بەجێهێشتن بە مردنە کـە لـەو سـەردەمە رێـژەی سەرسـورهێنەری تێپەرانـدووە، بۆیـە ئـەو سەردەمە بە جۆرەها شێوە دەتکاتـە مرۆڤێکی تـاق و تەنیا، مرۆڤێک کە ئیدی نابێت پشت بـە کـەس و پشـت بە هیچ ببەستی!

# ناوەرۆك

234

239